**پێشدەستی :**

الحمدلله والصلاة والسلام على رسول الله، ومن اهتدى بهداه

ئایا جنۆکە دەچێتە لاشەی مرۆڤەوە؟ لە دێر زەمانەوە ئەم پرسیارە خەڵکی دینداری بە خۆیەوە سەرقاڵ کردوە، بێگومان زانایان بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە بوونە دوو گروپی سەرەکی:

یەکیان کە پێی وایە بەڵێ، ئەوانە زۆرینەن، وە ئەویتریان پێی وایە نەخەیر کە لە ڕابردودا کەمینە بوون بەڵام لە ئێستادا ژمارەکە بەرچاوە، بە نەتیجەی ئەم جیاوازیە لێکەوتەی جیاوازیش لێکەوتۆتەوە، ئەوانەی بڕوایان وایە جنۆکە دەچێتە ناو لاشەی مرۆڤ هەڵدەستن بە چارەسەری ئەو حاڵەتەی کە پێیان وایە جنۆکە تەلەبوسی کردوە بە مرۆڤەوە، وە ئەوانەش بە پێچەوانەوەن بڕوایان بەو جۆرە چارەسەرە نیە و پێیان وایە ئەمە تەنیا حاڵەتی دەرونییەو پێویستە لە لای پزیشک چارەسەر بکرێ. دیارە بابەتەکە بەوەوە نەوەستاوە و شتی تری بە دووی خۆئدا هێناوە.

هەر ئەوانەی ئینکاری تەلەبوسەکە دەکەن، ئینکاری جادو و کاریگەریەکانیشی دەکەن، وە ئینکاری لەوەش دەکەن کە پێغەمبەری خوا: عليه أفضل الصلوات واتم التسليمات پەیوەندی بە جنۆکەوە بوبێ و ئەوانی بینیبێ.

لە ڕاستیدا چون و نەچونی جنۆکە بۆ ناو لاشەی مرۆڤ بابەتێکی بنچینەیی دین نییە، بابەتەکە بڕاوەو قەتعی نییە بەڵکو زەنییە، وە نابێ کەسی بەرامبەری پێ تاوانبار بکرێ و بخرێتە دەرەوەی بازنەی دین، وە دەبێ بە گفتوو گۆ چارەسەر بکرێ و قسەی لەسەر بکرێ، وە من پێم وایە ئەو بابەتە قەت یەکلایی نابێتەوە وەک بابەتە خیلافیەکانی تر، بەڵام لە گەڵ بونی ئەو ڕاستیانەی کە باسم کرد، من بە پێی بەڵگەی نەقلی و ئەقلی و واقعی و قسەی زۆربەی زانایان پێموایە کە شەیتان و جنۆکە کاریگەریان بەسەر مرۆڤەوە هەیەو جنۆکە دەچێتە لاشەی

مرۆڤەوە، بەڵام دەمارگیریم بۆ ئەم بۆچونەم نییە، هەرکەس بۆم بسەلمێنێ کەوا نییە من ئامادەم بە ئاسانی دەستبەرداری ئەم ڕایەو قەناعەتەم ببم، بەڵام من ئەوەندەی دیراسەی بۆچونی ئینکاریکارانی ئەم بابەتەم کردوە بەڵگەی قەناعەت پێهێنەرم نەبینیوە. وە دەمێکە لە جیهانی ئیسلامی قسە لە سەر ئەم بابەتە دەکرێ، وردە وردە بازی داوە بۆ ناو ئێمەش خەریکە دیبەیت و نوسینی لەسەر دەکرێ، وە من پێم باشە هەر بابەتێکی دینی بە هێدی دیراسەو دیبەیتی لەسەر بکرێ نەوەک بە حەماسەت و یەکتر تاوانبارکردن، ئەم نوسینە هەوڵێکە بۆ تیشک خستنە سەر ئەم بابەتە بە هیوای ئەوەی کە سودێکی هەبێ، وە من پێموایە لە ئێستادا گرفتی ئێمە ئەوە نییە بەڵکو گرفتی ئێمە دواکەوتوییە لە سیاسەت و هێزو پیشەسازی و ئابوری و ئازادی و یەکگرتوی و تەتبیق نەکردنی شەریعەت بە شێوەی جوان و یەکتر قەبوڵنەکردنە، خۆزگە چارەسەری ئەم دەردە کوشندانەمان دەکرد نەوەک باسی تەلەبوسی جنۆکە بە مرۆڤەوە .

گومان لەوەدا نیە کە پەیوەندی ئەرێنی و نەرێنی لە نێوان مرۆڤ و جنۆکەدا هەیە، وە قورئان زۆر بە ڕوونی باسی کردوە وە لە قورئانی پیرۆزدا سورەتێک هەیە بە ناوی (الجن)، وە زۆر باسی شەیتان و هێزی شەیتان کراوە، وە خوای گەورە گفتوگۆی لە گەڵ شەیتاندا کردوە، وە هێزی پێداوە و توانای مانەوەی پێداوە، وە شەیتان بەڵێنی داوە کە زۆربەی بەندەکان گومڕا بکا، وە ئادەمی لە خشتە بردوو لە خۆشترین شوێن وەدەری نا، وە لە دەیان بگرە سەدان ئایەت باسی مەترسی شەیتان و جنۆکە و شوێن کەوتوەکانیان کراوە، وە ئێمەی لێ ئاگادار کراوینەوە و دەبێ وریا بین و دژایەتیان بکەین، وە لە سەدان فەرمودەدا وریاییمان پێدراوە کە لە شەیتان وریا بین و پەنا بە خوا بگرین لێی.

بینا لە سەر ئەوەی باسم کرد لە کۆن و تازەدا گفتوگۆیەکی زۆر هەیە لە سەر ئەوەی ئایا کاریگەری جنۆکە بە سەر مرۆڤەوە هەیە؟ وە چەندە؟ وەچۆنە؟ وە ئایا

جنۆکە دەچێتە ناو لاشەی مرۆڤەوە و تەلەبوسی پێدەکا و دەتوانێ لە سەر زمانی ئەو قسە بکا؟

من دەمەوێ لەم لێکۆڵینەوەدا وەڵامی ئەو پرسیارە بدەمەوە، بە پێی تێگەیشتنم لە قورئانی پیرۆز و سونەتی بە پێزو مەقاسیدو ڕووحی شەریعەت بە پێی توانای ناتەواوی خۆم. جا ئەگەر پێکام ئەوە لە خواوەیە و تەنیا بەخششی ئەوە، وە ئەگەر هەڵە بوو تەنیا خۆم لێی بەرپرسم و هەڵەکە لە منەوەیە دین لێی بەرپرس نیە.

وە بۆیەش ئەم بابەتەم دەست پێکرد هەستم کرد مقۆ مقۆیەکی زۆر لە سەر دیبەیتەکەی بەڕێزان دکتۆر خالید گەردی و دکتۆر محمود زمناکۆی بە سەر پەرشتی دکتۆر سولەیمان پەیدا بوو، وە زۆر کەس پرسیاری دەربارە دەکا و تا ئەندازەیەک سەرگەردانی بۆ گەنجان و بەشێکی زۆر لە بینەرانی دیبەیتەکە پەیدا کرد، من دیبەیتەکەم پێباش بوو هەرچەند لە وانەیە شتی زۆر لەوە گرنگتر هەبێ باسی لێوە بکەین بەڵام بەهەر حاڵ با گفتوگۆو لێکۆڵینەوە لە بابەتە دینی و زانستیەکان و هەموو بوارەکانی تر بەردەوام بێ.

وە ئەم کتێبە لەم چەند تەوەرەیەی خوارەوە پێکدێ:

تەوەری یەکەم: مانای شەیتان و جنۆکە چیە، وەچ پەیوەندیەکیان بە یەکەوە هەیە؟

تەوەری دووەم: حیکمەتی دروستبوونی شەیتان چیە؟

تەوەرەی سێ یەم: شەیتان و جنۆکە لە قورئاندا چۆن باسی کراوە و کاریگەریان چیە لە سەر دروستکراوەکان بە گشتی و مرۆڤ بە تایبەتی؟

تەوەری چوارەم: شەیتان و جنۆکە چۆن لە فەرمودەدا باسیان کراوە و کاریگەریان چیە لەسەر مرۆڤ؟

تەوەری پێجەم: شەیتان و جن لای دینە ئاسمانیەکانی تر بێجگە لە ئیسلام.

تەوەری شەشەم: بەراوردکاری لە نێوان ئەو دوو ڕوانگەی کە باسی چون و نەچونی جنۆکە دەکەن بۆ ناو لاشەی مرۆڤ.

تەوەری حەوتەم: وەڵام ئەوانە کە ئینکاری تلبس بونی ئینسان بە جنۆکە دەکەن

تەوەری هەشتەم: ئایا جنۆکە تەکلیف کراون بە شوێن کەوتنی پێغەمبەر؟ وە ئایا پێغەمبەر ئەوانی بینیوە؟

تەوەری نۆیەم: چۆن خۆمان بپارێزین لە شەیتان و جنۆکەو زیانەکانیان؟

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين

## تەوەری یەکەم

### مانای شەیتان و جن چیە؟

شەیتان لەڕووی زمانەوانی :

١. شەیتان لە (شطن) هاتوە واتە (بعد) دورکەوتەوە، دەوترێ( بئر شطون : قعرها بعيد) ئەو بیرەیە کە زۆر قوڵە.

٢. بە واتای بە هیلاکچون و سوتان هاتوە: واتە لە (شاط يشيط) هاتوە واتە بە هیلاکچوو سوتا، فیعلەن هەروایە چونکە بە هۆی بێ فەرمانی خوا بە هیلاک چوو، وە بە ئاگر دەسوتێ.

٣. زوجاج دەڵێ: و معنى الشيطان فى اللغة: الغالى فى الكفر: ئەوەی کە تێی پەڕاندوە لە بێباوەڕی.

٤. فەیروز ئابادی دەڵێ: شاط يشيط: إذا احترق غضبا، واتە ئەوەی کە لە تورەی دەسوتێ.

٥. رازی دەڵێ: الشيطان مأخوذ من (شطن) اذا بعد فحكم عليه بكونه بعيدا: واتە لە شطن هاتوە واتە دورکەوتەوە بۆیە حوکمی لەسەردرا بە دوورکەوتنەوە.

٦. ئیبن کەسیر دەڵێ: الشيطان فى لغة العرب مشتق من شطن اذا بعد، فهو بعيد بطبعه عن طباع البشر، وبعيد بفسقه عن كل خير: کەواتە بە سروشتی خۆی لە مرۆڤ دورە و بە تاوانباریشی لە چاکەو خێر دوورە.

وە لەم دوو مانایە زۆربەی زانایان یەکەم هەڵدەبژێرن واتە بە مانای دوورکەوتنەوە، وە هەندێکیان دەڵێن هەردوکیان ڕاستن لە ڕووی زمانەوانیەوە، وە هەردوو واتاکەشی تێدا دێتە دی.

وە شەیتان لە شەرعدا بەو دروستکراوە دەوترێ کە لە خوا یاخی بوو، وە فەرمانی خوای ڕەتکردەوە و دژایەتی خۆی بۆ بەندەکانی خوا ڕاگەیاند.

لێرەدا مەبەستمان شەیتانی گەورەیە، دەنا هەرکەس لە خوا یاخی بێ و دژایەتی خوا بکاو دژایەتی بەندەکانی خوا بکە لە مرۆڤ و جنۆکە ئەوە شەیتانە، وە هەندێک ئاژەڵیش ناوی شە یتانیان لێنراوە لە بەر سروشتی خراپ و زیانبەخشیان.

**ناوی شەیتان لە قورئانی پیرۆزدا:**

1. البقرة : ٢٦،١٦٨،٢٠٨،٢٦٨،٢٧٥
2. آل عمران: ٣٦،١٥٥،١٧٥
3. النساء: ٣٨،٦٠،٧٦،٧٦،٨٣،١١٩،١٢٠
4. المائده: ٩٠،٩١
5. الانعام: ٤٣،٣٨،١٤٢
6. الاعراف: ٢٠،٢٢،٢٧،١٧٥،٢٠٠،٢٠١
7. الانفال: ١١،٤٨
8. يوسف: ٥،١٠٠،٤٢
9. ابراهيم: ٢٢
10. الحجر: ١٧
11. النحل: ٦٣،٩٨
12. الاسراء: ٢٧،٥٣،٥٣،٦٤
13. الكهف: ٤٤،٤٤،٤٥
14. طه: ١٢٠
15. الحج: ٥٢،٥٣ ٣،٥٢
16. النور: ٢١،٢١
17. الفرقان: ٢٩

18. النمل: ٢٤
19. القصص: ١٥
20. العنكبوت: ٣٨
21. لقمان: ٢١
22. فاطر: ٦
23. يس: ٦
24. الصافات: ٧
25. ص: ٤١
26. فصلت: ٣٦
27. الزخرف: ٦٢
28. محمد: ٢٥
29. المجادله: ١٠، ١٩،١٩، ١٩
30. الحشر: ١٦
31. التكوير: ٢٥

لەو شوێنانەی باسکران بە تاک هاتووە.

بەڵام لەوانەی بە کۆ هاتووە:

1. البقرة: ١٤،١٠٢،١٠٢
2. الانعام: ٧١،١١٢،١٢١



3. الاعراف: ٢٧،٣٠
4. الاسراء: ٢٧
5. مريم: ٦٨،٨٣
6. الانبياء: ٨٢
7. المؤمنون: ٩٧
8. الشعراء: ٢١٠.٢٢١
9. الصافات: ٦٥
10. ص: ٣٧
11. الملک:٥

ناوێکی تری شەیتان (إبليس)ە ئەم ناوەش لە قورئاندا ١١ جار هاتوە.

إبليس بە چ واتايەک هاتووە:

يەک: أبلس الرجل: قطع بە واتە پچران و دابران.

دوو: أبلس : سکت بێدەنگ بوو.

سێ: أبلس: يئس وندم: بێ هيوا بوون و پەشيمان بوونەوە.

چوار: الابلاس: الحيرة: واتە سەرگەردانی.

هەموو ئەو واتايانە راستن، وە لە شەيتاندا هاتونە دی.

**الغرور:**

**یەکێکی تر لە ناوو سیفەتەکانی شەیتان ( الغرور) لە سەر کێشی (فعول) کە سیغە مبالغەیە بە مانای زۆر فریودەر، کەس ئەوەندەی شەیتان خەڵکی فریو نەداوە.**

**الوسواس:**

**یەکیتر لە ناوو وەسفەکانی شەیتان وسواسە چونکە زۆر وەسوەسە و خوتخوتەی خراپ دەکا.**

**الطاغوت:**

**بەمانای زۆر سەپێچی کارو سەرکەش و تێپەڕ لەسنور دێ، ئەمەش وەسفێکە تەواو بەسەر شەیتاندا جێبەجێ دەبێ.**

**مانای (جن )جنۆکە چیەو بە واتای چ دێ؟**

**لە قورئانی پیرۆزدا ٢٢ جار ناوی جن هاتوە، وە سورەتێک هەیە لە قورئاندا بە ناوی ( سورة الجن).**

**ئەمە بەڵگەی ئەوەیە کە جنۆکە مەخلوقێکی گرنگ و کاریگەرە وە لە پێش مرۆڤدا دروستبووە.**

وَٱلْجَآنَّ خَلَقْنَٰهُ مِن قَبْلُ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ (الحجر: ٢٧) **جنۆکەشمان پێشتر دروست کرد لە ئاگرێکی بەتین.**

**جن ئەو شتەیە کە نادیارە و نابینرێ:**

1. **جنة: کە پیتی جیمەکە سەری هەبێ واتە باخ و دارستان لە بەر چری پڕی ئەو ناوەی لێنراوە چونکە شتی تێدا بزر دەبێ.**

2. جنة: کە پیتی جیم بۆری هەبێ واتە قەڵغان چونکە جەنگاوەر دادەپۆشی و دەیشارێتەوە.

3. جنون: چونکە شێت ژێری بزر بوە و داپۆشراوە.

4. أجنة: کۆرپەلەیە لە بەر ئەوەی لە سکی دایکیا شاردراوەتەوە.

5. جنة: کە پیتی جیم ژێری هەبێ بە فریشتە گوتراوە چونکە مرۆڤ نایبینێ مەگەر پێغەمبەران و مرۆڤە باشەکان.

هەروەک جنۆکە خۆشی ئەو ناوەی لێ یە چونکە نابینرێ.

بە مانای خێرایش دێ وەک بە مارێکی خێرا وتراو( جان) .

جنۆکە دروستکراوێکی خوای گەورەیە پێش مرۆڤ دروستبووە، چاک و خراپی هەیەو وەک ئێمە جێگای تەکلیف ن وە یەکێکە لە دووە قورس و سەنگینەکان (الثقلان)

هیچ زانایەکی ئەهلی سونە نیە کە لە باسی بیرو باوەردا باسی جنۆکەی نەکردبێ و ئیمانی پێ نەبێ.

وە هەندێک لە موعتەزیلە و جوهەمیرکان و مەزاهیبی تر هەن کە ئینکاری دەکەن بەڵام قسەکەیان چونکە پێچەوانەی قورئان سونەت و هەموو دینە ئاسمانیەکانە هیچ گرنگیەکی نیە.

دیارە باسی ئەوەش هەیە ئایا شەیتان جنۆکەیە؟

دیارە لەسەر ئەمە ڕاجیایی هەیە بەڵام لەبەر ئەوەی لە قورئاندا بە ڕوونی ئەوە باسکراوە پێویست ناکا ڕاجیایی لەسەر بێ، خوای گەورە دەفەرموێ:

وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُواْ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِۦٓ أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِي وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّۢ بِئْسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلًا (الكهف: ٥٠) بیریان بهێنەرەوە کاتێك بە فریشتەکانمان وت سوژدە بەرن بۆ ئادەم ئەوانیش هەموو سوژدەیان برد جگە لە ئیبلیس نەبێت کە لە پێڕی پەرییەکان بوو بۆیە لە فەرمانی پەروەردگاری دەرچوو دەی ئایا ئێوە (ئەی ئادەمیزادەکان) ئەوو نەوەی دەکەن دۆست و پشتیوانی خۆتان لە جیاتی من لە کاتێکدا کە ئەوان دوژمنی ئێوەن ئای چ گۆڕینەوەیەکی خراپە بۆ ستەمکاران.

وە ئایا شەیتان فریشتە بووە یان دروستکراوێکی سەربە خۆ بووە؟ بە پێی بەڵگەی قورئانی زۆر ناکرێ شەیتان فریشتە بووبێ بۆ؟:

1. شەیتان رەگەزی جیاوازە و مادەی دروستبونی جیاوازە چونکە جنۆکەیە و جنۆکەش لە ئاگرە، لە کاتێکدا فریشتە لە نورە.
2. فریشتە سەرپێچی خوا ناکا بەڵام ئەو کردی.
3. فریشتە لە رەحمەت دەرناکرێ ئەو دەرکرا.
4. فریشتە لە سروشتیدا نیە تاوان بکا بەڵام ئەو کردی.
5. فریشتە تەنها ئیلهامی چاک دەکا بەڵام شەیتان وەسوەسەو ئیلهامی خراپ دەکا.

دەوترێ ئەی بۆچی کە خوای گەورە فەرمانی بە فریشتەکان کرد بە کڕنۆش بردن شەیتان نەیبرد، ئەگەر شەیتان فریشتە نیە چی دەکرد لە ناو فریشتەکان؟ کۆمەڵێک وەڵام هەیە بەڵام مانع و ڕێگر نیە کە لەو کاتەدا شەیتان لە ناو ئەواندا بوبێ و بەندایەتی کردبێ، چونکە دونیای پەری و فریشتە دوو جیهانی تەواو لێک نزیکن.

دەوترێ ئەدی بۆ جیا کردنەوەی شەیتان بە (استثناء) بوە؟ وە دەکرێ ئەو جیاکردنەوەیە استثناءی متصل بێ وەتە مەبەست ئەوەیە شەیتان لە پێرو ڕەگەزی فیرشتەکان بێ.

ئێمە ئایەتمان هەیە کە شەیتان جنۆکەیە.

ئێمە بەڵگەمان هەیە کە فریشتە سەرپێچی ناکا.

کێ دەڵێ استثناء منقطع نیە کە لە زمانی عەربی و قورئانی پیرۆزدا زۆرە.

وە هەتا ئەگەر استثناء لە وێ متصل بێ مەبەست اتصال ی حەقیقی نیە بەڵکو مەجازییە چونکە خۆی وەک فریشتە لێکردوە لە بەندایەتی و گوێرایەڵی بۆیە لەوکاتە ئەگەر استثنایەکە متصل ش بێ ئیشکال دروست ناکا.

## تەوەرەی دووەم

### حیكمەتی دروستبوونی شەیتان چیە؟

١. مرۆڤی مسوڵمان دڵنیایە كە خوای گەورە كار لەجێ یە و هیچ كارێكی بێ حیكمەت ناكا چونكە ناوی حكیم و علیم و خبیرو لطیفە.

٢. شەیتان بۆ ئەوە دروست نەبوە وای بەسەر بێ بەڵكو بۆ عیبادەت دروست بوە خوای گەورە دەفەرموێ: وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ (الذاريات: ٥٦) واتە: وە من جنۆكە و ئادەمیزادم تەنها بۆ ئەوە دروست كردووە كە بەندایەتی من بكەن. بەڵام شەیتان لەبەر ئەوەی كە ئازاد بو ئازادیەكەی خراپ بەكار هێناو گومرا بو.

وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِۦٓ أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِى وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّۢ بِئْسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلًا (الكهف: ٥٠) واتە: بیریان بهێنەرەوە كاتێك بە فریشتەكانمان وت سوژدە بەرن بۆ ئادەم ئەوانیش هەموو سوژدەیان برد جگە لە ئیبلیس نەبێت كە لە پێڕی پەرییەكان بوو بۆیە لە فەرمانی پەروەردگاری دەرچوو دەی ئایا ئێوە (ئەی ئادەمیزادەكان) ئەو و نەوەی دەكەن دۆست و پشتیوانی خۆتان لە جیاتی من لە كاتێكدا كە ئەوان دوژمنی ئێوەن ئای چ گۆڕینەوەیەكی خراپە بۆ ستەمكاران (كان من الجن ففسق عن أمر ربه).

٣. مرۆڤ دەسەڵاتی نەبوە نەلەهاتن و نەلەمردن نە لەنێرو مێ یایەتی و هتد، وە ئەو مرۆڤە مادام هەست بە بێ دەسەڵاتی خۆی دەكا ژیرانە ئەوەیە كە خۆی رزگار كا نەوەك بڵێ بۆ؟، وەك ئەو كەسەی لەسواری فرۆكەیەك بێ لەئاسمان كابتنەكە بڵێ ئاگادار بن، خۆتان ئامادەكەن، قیناع ببەستن، سەرتان داخەن، ئەمە دەرگایەكانن، ئایا ئەو سەرنشینانە كاری ژیرانە ئەوە نیە خۆیان ئامادە بكەن یان

بڵێن بۆ؟ دەی دیارە مادام ئێمە لێرەین با خۆمان دەربازکەین نەوەک خەریکی ئەوە بین بڵێیین بۆ؟

٤. شەیتان ئازاد بوو ناچار نەبوو بۆ گوناهکردن کەواتە بۆ گلەیی لەخوادەکرێ؟!

٥. لە هەموو دونیا ئازادی جێگای شانازیە وە خەڵک داوای دەکا دەی باشە خوای گەورە کەمرۆڤی ئازاد کردوە بۆ گلەی دەکرێ لە خوای گەورە!.

٦. ژیان تاقیکردنەوەیە، جنۆکەو مرۆڤ بۆ تاقیکردنەوە دروست بوون (لیبلوکم) لە هەموو سیستەمەکانی دونیا گەیشتن بەپلە باڵاکان لەهەر بوارێکدابێ دەبێ بەتاقیکردنەوە پێیدا تێ بپەری، کەسێک بێ تاقیکردنەوە بەرز بێتەوەو شەهادە وەربگرێ خەڵک متمانەی پێ ناکاو گاڵتەیان پێ دێ، باشە بۆ لەهەقی هەموو مرۆڤایەتی تاقیکردنەوە باشە بەلام لەهەقی خوا خراپە؟!

٧. ئێمە لە بونەوەردا شتێکی بێ حیکمەت نابینین، ئەی بۆ دەبێ شەیتان، مرۆڤ، جنۆکە بێ حیکمەت بن؟.

٨. خوای گەورە هەموو ئامرازەکانی تاقیکردنەوەی لەبەردەم مرۆڤایەتی داناوە، کەواتە ئێمە حەقی گلەییمان نیە.

٩. یەکێک بۆی هەیە بڵێ جا بۆ تاقیمان دەکاتەوە؟ دەڵێی (لایسئل عما یفعل وهم یسئلون) پرسیار لەخوا ناکرێ بەڵکو پرسیار لەئێمە دەکرێ بۆ لەتاقیکردنەوەکە دەرنەچوی؟ بۆ خۆتت ئامادە نەکرد؟ بۆ دەرنەچوی؟ چت نوقسان بوو؟ وەهەروەها...

١٠ خوای گەورە شەریعەت و پێغەمبەرانی بۆ ئێمە رەوانە کردوە بۆ ئەوەی بەرچاومان ڕون بێ و فریو نەخۆین و ڕێگای راست بدۆزینەوە.

١١. خــوای گەورە شــەیتان و شــەیتان ســیفەتەکانی بەئــێمە ناســاندوە بــۆ شوێنیان دەکەوین؟!.

١٢. خوای گەورە دۆزەخ و بەهەشتی بۆ داناوین بۆ ئەوەی پابەندمانکا ئەمەش لەڕەحمەتی خۆیەتی.

١٣. خوای گەورە زۆر جار پێش قیامەت سزامان دەدا بۆ ئەوەی بەئاگا بێینەوە نابێ بڵێـین بـۆ؟ چـونکە هەمـو سیسـتەمەکانی سـەر زەوی یەک دەنگـن لەسـەر بوونی سزا، ناشکرێ هەمو مرۆڤایەتی بەهەڵەداچوبێ.

١٤. ناکرێ ئێمە بەخوا بڵێین بۆ شەیتان یـان ئـێمەت دروسـت کـردوە چـونکە ئەمـرو خەلـق تـایبەتە بەخـۆی، هەروەک هـیچ کـام لەێـمە قبـوڵ ناکـا پرسـیارە تایبەتیەکانی لێ بکرێ کەزۆر تایبەتن بەخۆی وەک بڵێی لوتت بۆ وایە؟ باڵات بـۆ کورتە؟ بۆ واناشیرنی؟ مناڵەکەت یـان خیـزانەکەت هتـد بـۆ وایە یەکسـەر دەڵـێ مەیەرە نـاو ژیـانی تـایبەی مـن، ئەی تـۆ چـۆن لەخـوای گەورە ئەو پرسـیارانە دەکەی؟.

١٥ خوای گەورە حیکمەتی هەمو شتەگرنگەکانی بۆ ڕونکردوینەوە لەژیاندا ئیتر بیانویەکمان نەماوە.

١٦. خوای گەورە گوناهەکانمان بەیەک بۆ حساب دەکـا، بەڵام چـاکە کـان یەک بەدەیان و سەدان و هەزاران.

١٧. ئاوەدان کردنەوەی زەوی بەئازادی و تاقیکردنەوە دەکرێ بۆیە دەبــێ ئـێمە ئــازادبین بــۆ ئەوەی داهێنــان بکەیــن ئەگەر وەک فریشــتە بــاین زەوی ئــاوەدان نەدەبۆوە.

١٨. با ئێمە تەماشای رەحم و گەورەیی خوا بکەین، دەبینین تەنها مرۆڤ و جنۆکە ئازادیان هەیە، کەچی ئەوان ژیانیان تاڵ کردووەو ژیان و ژینگەیان تێک داوە، ئەی باشە ئەگەر رۆژو مانگ هەسارەکان ئازاد بان دەبو چ روی دابا!.

١٩. دەرکەوتوە دین مرۆڤ بەختەوەر دەکا، مەگەر مرۆڤ لەبەختەوەری ناگەرێ؟ بەڵام بەمەرجێک دین بەراستی جێ بەجێ بکرێ، کەواتە دەبێ ئێمە خۆمان بەقەرزار بزانین یان نارازی بین؟!

٢٠. لەدین دا فەلسەفەی ژیان ڕونە بەڵام لەئیلحادو ماددی گەراییدا مرۆڤ نوقمی بەدبەختی و ئاشوب و بەڵا دەبێ ئایا تێ گەیشتن لە فەلسەفەی ژیان باشە یان خراپە؟.

٢١. ئەوانەی ئەوجۆرە پرسیارانە دەکەن وەڵامیان بۆ پرسیارەکەی خۆیان پێ نیە، بەدیلیش قەبوڵ ناکەن ئەی چارەیان چیە؟.

٢٢. زۆربەی مرۆڤایەتی بروای بەخوا هەیەبەشێک لە مرۆڤایەتی مولحیدە، وە زۆربەی مولحیدەکانیش (اللامنتمی) ن، واتە بەدوای ئەوەدا ناچن ئەوە بۆ وایە، ئەوە بۆ وایە، بەڵکو حەز دەکەن ڕابوێرن بۆیە لە جۆرە پرسیارانە رادەکەن، چونکە ئەگەر پرسیار کەن دەبێ کۆڵنەدەن و دواتر بە نەتیجەی لێکۆڵینەوەکەیان پابەند بن، ئایا ئەوان ئەوەیان دەیەوێ؟ یان دەیانەوێ ڕابواردنەکەیان لێ تێک نەچێ؟.

٢٣. لە کۆتایدا ئیماندار گەلێک شادومان و بەختەوەرە کە فەلسەفەی حەیاتی لاڕونەو داهوتویەکی مسۆگەری هەیە، لەروانگەی ئیمانەوە لەهەموشتە بنچینەییەکان تێ دەگا، بەڵام کاکی مولحید سەرلێ شیواوەو خۆی بزر کردوە: فَأَيُّ ٱلۡفَرِيقَيۡنِ أَحَقُّ بِٱلۡأَمۡنِ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ} (الأنعام: ٨١).

٢٤. رۆژێک گوێم لەمولحیـدێک بـوو لەگەڵ بانگخوازێـک گفتوگـۆی دەکـرد دەی گوت چۆن دەکرێ پرسیاری هەمومان یەک بـێ لەکاتیکـدا ژیـری ئـێمە جیـاوازی هەیە؟!

وەڵام بەکورتی و پـوختی ئەوەیە: خـوای گەورە پرسـیاری سـادەی ئاراسـتەی هەمومان کردوە خوێندەوارو نەخوینـدەوار بەئاسـانی تێـی دەگـا، باسـی کیمیـاو فیزیاو جەبرو هەندەسەو پزیشکی نیە. پێمان دەڵێ :

- ❖ خوات کێ یە؟
- ❖ پێغەمبەرت کێ یە؟
- ❖ دینت کامەیە؟
- ❖ بۆ دروست بوی؟
- ❖ کێ دروستی کردوی؟
- ❖ داهاتوت بۆ کوێ یە؟

دەکرێ ئەگەر خوێندەواریش نەبی لەڕێی پرسیارەوە لەم وەڵامانە تێ بگەی.

٢٥. جەنابی مولحیدەکان شەیتان هیشتا ماوەو نەمردوە بۆ ناچن پرسیاری لێ بکەن بڵێن جەنابی شەیتان بۆ ماڵی ئێمەو خۆشت خەرا کرد بۆ بەو رۆژە رەشەت گەیاندین !.

٢٦. بە هۆی شەیتانەوە پێشبرکێ و کیش مەکێش پەیدا بوە کە ئەمە هۆکاری پێشکەوتنە، چونکە کێ بەرکێ هۆکاری پێش کەوتنە.

٢٧. ئێمە دوو نمونەمان هەیە، نمونەی ئادەم کە تاوانی کردو پەشیمان بویەوە خوای گەورە تەوبەی قەبوڵ کردو هەڵی بژاردو کردییە پێغەمبەر، دونیاو دوا رۆژی

بردوە، وەنمونەی شەیتانیشمان هەیە کەتاوانی کردو پاساوی نادروستی بۆ خۆی هێنایەوە بۆ یە دین و دونیای دۆراند، جا ئەو کەسەی وە دو ئەو کەسە دۆڕاوە دەکەون بۆ دەبێ گلەیی بکەن کاتیک هەمان سەرەنجامیان دەبێ.

٢٨. چەندین پلەی باڵای بەندایەتی هەیە کە مرۆڤ بە هەوڵدان و خۆماندو کردن نەبێ نایگاتێ، بۆیە بەهۆی شەیتان و شەیتان سیفەتەکانەوە ئەم پلانە بەدەست دێن کە ئەمەش حیکمەتی خۆی هەیە.

٢٩. ئادەم ژیانی دوای گوناهکردنی باشتر بوو لەپێش تاوانکردنی بەهۆی تەوبەوە، کەواتە مەرج نیە ئەگەر تاوانمان ئەنجام دا کۆتایی بەهەموو شتێک بێ، بەڵکو لەوانەیە هۆکاری پێش کەوتن بێ لەهەموو بوارەکانی ژیان یان زۆربەی بوارەکان.

## تەوەرەی سێ یەم

### شەیتان و جنۆکە لە قورئاندا چۆن باسی کراوە و کاریگەریان چیە لە سەر دروستکراوەکان بە گشتی و مرۆڤ بە تایبەتی؟

دیارە ئەگەر ئێمە بە گشتی تەماشای قورئانی پیرۆز بکەین دەبینین کە شەیتان و جنۆکە چ توانا و هێزێکیان هەیە بۆ گومراکردن و تاوانکردن بە خەڵک، کە ئەو تاوان و خراپەکاریانە هیچیان کەمتر نیە لە چونە ناو لاشەوە بەڵام بە شێوازی تر.

**بابچینە خزمەت قورئانی پیرۆز و تەماشای هێزو کاریگەریەکانی شەیتان جنۆکە بکەین لەسەر مرۆڤ بە تایبەت:**

١. وەدەر نانی ئادەم و حەوا لە بەهەشت: فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ وَقُلْنَا ٱهْبِطُواْ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ وَلَكُمْ فِي ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ (البقرة: ٣٦) بەڵام شەیتان هەڵی خەڵەتاندن و لەو شوێنە بەدەرکردنیدان کە لێی بوون، بۆیە پێمان وتن: «دابەزن! ئێوە دوژمنی یەکترن. لە زەوی شوێنی حەوانەوە و ڕابواردنتان ئەبێت تا ماوەیەك.

٢. شەیتان هەنگاو و پلانی هەیە و دوژمنێکی ئاشکرایە: يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ كُلُواْ مِمَّا فِي ٱلْأَرْضِ حَلَٰلًا طَيِّبًا وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ (البقرة: ١٦٨) ئەی خەڵکینە بخۆن لەوەی کەلە زەویی دایە بەحەلاڵی و پاکی وە دوای هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون بەڕاستی شەیتان دوژمنێکی ئاشکراتانە.

٣. فەرمان دەکا بە تاوانی گەورە و بچوک: إِنَّمَا يَأْمُرُكُم بِٱلسُّوٓءِ وَٱلْفَحْشَآءِ وَأَن تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ (البقرة: ١٦٩) بەڕاستی (شەیتان) فەرمانتان پێ دەدات بە تاوان و خراپە لەگەڵ هەڵبەستنی شتی وا بەدەم خواوە کە نازانن.

**٤. بەڵێندان بە هەژاری و خراپە:** ٱلشَّيْطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِٱلْفَحْشَآءِ وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلًا وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ (البقرة: ٢٦٨) **شەیتان دەتان ترسێنێ بە هەژاری وە فەرمانتان پێدەدات بە خراپە وە خوا بەڵێنی لێخۆشبوون و چاکەتان پێدەدات خوا فراوان میهرەبانی زانایە.**

**٥. فریودانی جولەکە و مەسیحی سەبارەت بە سولەیمان، هەتا ئێستاش دوو ملیار مەسیحی زیاتر سولەیمان بە کافرو پتپەرست و ئارەزو بازو خائین دەزانێ، ئایا ئەمە توانایەکی لە ڕادە بەدەر نیە کە شەیتان و جنۆکەکان هەیانە؟ :** وَٱتَّبَعُواْ مَا تَتْلُواْ ٱلشَّيَٰطِينُ عَلَىٰ مُلْكِ سُلَيْمَٰنَ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَٰنُ وَلَٰكِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ كَفَرُواْ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحْرَ وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَٰرُوتَ وَمَٰرُوتَ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦ وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَلَقَدْ عَلِمُواْ لَمَنِ ٱشْتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنْ خَلَٰقٍ وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْاْ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ(البقرة: ١٠٢) **جوولەکەکان دوای ئەو(شتانە) کەوتن کەشەیتانەکان دەیان خوێندەوە (بۆ خەڵکی) لەسەردەمی پاشایەتی سولەیمان دا، وە سولەیمان بێ بڕوا نەبوو بەڵام شەیتانەکان بێ بڕوا بوون خەڵکیان فێری جادوو دەکرد هەروەها ئەوەی نێردراوەتە خوارەوە لە بابل بۆ سەر هارووت و ماroot(دوو فریشتە بوون) وە(ئەمانە) کەسیان فێر نەدەکرد تا پێیان نەوتایە ئێمە هەرتاقی کەرەوەی (ئادەمیزاد) ین کەواتە بێ بڕوامەبە ئینجا فێری جادووی وا دەبوون لێیانەوە کە ژن و مێردی پێ لەیەک بکەن ئەوان بەم جادووە ناتوانن زیان بەکەس بگەیەنن مەگەر بەویستی خوا وە فێری شتێک دەبن کە زیانیان پێ دەگەیەنێ نەک قازانج بێگومان زانیان هەرکەسێ جادوو بکڕێ(بە فەرموودەی تەورات) لەڕۆژی دواییدا بێ بەش دەبێ بەڕاستی زۆر بەدە ئەو شتەی کە(بڕوای) خۆیانیان پێ فرۆشت ئەگەر بیانزانیایە.**

**٦. فێرکردنی سیحر بە بەڵگەی هەمان ئایەتی پێشوو.**

**٧. لێکجیاکردنەوەی ژن و مێرد بە بەڵگەی هەمان ئایەت.**

**٨. مەس و دەست لێوەشاندن و سەرگەردانکردن:** ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِى يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيْطَٰنُ مِنَ ٱلْمَسِّ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْبَيْعُ مِثْلُ ٱلرِّبَوٰاْ وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْ فَمَن جَآءَهُۥ مَوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ فَٱنتَهَىٰ فَلَهُۥ مَا سَلَفَ وَأَمْرُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ وَمَنْ عَادَ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ (البقرة: ﴿٢٧٥﴾) **ئەوانەی کە دەخۆن سوو(الربا) ڕاست نابنەوە (لە گۆڕەکانیاندا) مەگەر چۆن کەسێ ڕاست دەبێتەوە کە شەیتان دەستی لێ وەشاندبێ (وە تووشی فێ بووبێ) ئەوە بەهۆی ئەوەوەیە، سوو خۆران وتیان: کڕین و فرۆشتن وەک سوو وایە لەکاتێکدا خوا ڕێ ی داوە بە کڕین و فرۆشتن بەڵام سووی قەدەغە کردووە ئینجا ئەو کەسەی پێی گەیشت ئامۆژگاری یەک لە پەروەردگاری یەوە، وە خێرا دەستی لێ هەڵگرت ئەوا ئەوەی لەوەپێش وەری گرتووە بۆخۆیەتی( لە سوو خواردن) وە کاری ئەو حەواڵە بەخوایە، وە ئەوەی گەڕایەوە(بۆ سوو خواردن) ئا ئەوانە هاوڕێ ی ئاگرن تیا دەمێننەوە بە ئێجگاری.**

**٩. ڕازاندنەوەی خراپەو جوان وێناکردنی:** فَلَوْلَآ إِذْ جَآءَهُم بَأْسُنَا تَضَرَّعُواْ وَلَٰكِن قَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ (الأنعام: ﴿٤٣﴾) **دەی بۆ نەپاڕانەوە کاتێك سزای ئێمەیان بۆ هات ؟ بەڵام دڵیان ڕەق بوو وە شەیتان ئەو کردەوە خراپانەی بۆ ڕازاندبوونەوە کە دەیانکرد.**

**١٠. هەڵخەڵەتاندن و لە خشتە بردن هەتا وای لێکردن مەیدانی جەنگیان بەرامبەر کافران چۆلکرد:** إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَلَّوْاْ مِنكُمْ يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ إِنَّمَا ٱسْتَزَلَّهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ بِبَعْضِ مَا كَسَبُواْ وَلَقَدْ عَفَا ٱللَّهُ عَنْهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ (آل عمران: ﴿١٥٥﴾) **بەڕاستی ئەوانەی پشتیان هەڵکرد لەناوتاندا لەو ڕۆژەی کە هەردوو کۆمەڵ**

**گەیشتن بەیەک (لە ئوحود دا) بێگومان تەنها شەیتان هەڵی خلیسکاندن بەهۆی هەندێ لەو گوناهانەی کە لەوەبەر کردبوویان سوێند بێ بێگومان خوا لێ یان خۆشبوو چونکە بەڕاستی خوا لێبووردەی پەلەنەکەرە لە تۆڵە سەندن دا.**

**١١. ترساندنی دۆستەکانی خوا، یان شوێنکەتوەکانی خۆی، گرنگ ئەوەیە دەتوانێ ترساندن بکا:** إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَآءَهُۥ فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ (آل عمران: ١٧٥) **بە ڕاستی ئەوەی ئێوە (سارد دەکاتەوە) تەنها شەیتانە کە دۆست و(برادەرانی) خۆی دەترسێنێ جائێوە لێیان مەترسن وە لە من بترسن ئەگەر ئێوە بڕوادارن.**

**١٢. دەبێتە خراپترین دۆست و هەمنشینی مرۆڤ:** وَٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَمَن يَكُنِ ٱلشَّيْطَٰنُ لَهُۥ قَرِينًا فَسَآءَ قَرِينًا (النساء: ٣٨) **وە ئەوانەی ماڵەکانیان دەبەخشن لەبەر ڕوپامایی خەڵکی باوەڕیش ناهێنن نە بەخوا و نە بەڕۆژی دوایی وە هەر کەس شەیتان هاوڕێی بێت ئەوە(شەیتان) هاوڕێییەکی زۆر خراپە.**

**١٣. شەیتان دەتوانێ خەڵکی زۆر و هەڵخەڵەتاندنی زۆر بکا:** أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓا۟ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوٓا۟ أَن يَكْفُرُوا۟ بِهِۦ وَيُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا (النساء: ٦٠) **ئایا ئاوڕێکت نەداوەتەوە بەلای ئەوانەی وا خۆ نیشان دەدەن کە بەڕاستی ئەوان باوەڕیان هێناوە بەوەی دابەزیوە بۆتۆ(کە قورئانە) و بەوەش کە پێش تۆ دابەزیوە(کە تەوراتە) دەیانەوێت کە داد بەرن بۆ لای یەکێك کە حوکم بە بەرنامەی خوا ناکات لە کاتێکدا بەڕاستی فەرمانیان پێ کراوە کە بڕوایان پێی نەبێت وە شەیتان دەیەوێت کە گومڕایان بکات بە گومڕایی یەکی دوور لە ڕاستی.**

١٤. ئەگەر فەزڵ و میهرەبانی خوا نەبێ خەڵکان هەموی شوێنکەوتەی شەیتان دەبن: وَإِذَا جَآءَهُمْ أَمْرٌ مِّنَ ٱلْأَمْنِ أَوِ ٱلْخَوْفِ أَذَاعُواْ بِهِۦ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُوْلِى ٱلْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسْتَنۢبِطُونَهُۥ مِنْهُمْ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ لَٱتَّبَعْتُمُ ٱلشَّيْطَٰنَ إِلَّا قَلِيلًا (النساء: ﴿٨٣﴾) وە کاتێك هەواڵێکیان پێ بگات دەر بارەی ئاسایش و هێمنایەتی یان لە بارەی ترسەوە بڵاوی دەکەنەوە بەڵام ئەگەر بیان گەڕانایەتەوە بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و بۆ لای کار بەدەستانی خۆیان ئەوە ئەوانەی ڕاستی هەواڵەکان دەردەهێنن دەزانن هەواڵەکە(ڕاستە یان درۆیە) وە ئەگەر چاکەو بەزەیی خوا نەبوایە بەرامبەر بە ئێوە بێگومان شوێن شەیتان دەکەوتن کەمێکتان نەبێت.

١٥. شەیتان شوێن کەوتو یارو یاوەری هەنە: ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱلطَّٰغُوتِ فَقَٰتِلُوٓاْ أَوْلِيَآءَ ٱلشَّيْطَٰنِ إِنَّ كَيْدَ ٱلشَّيْطَٰنِ كَانَ ضَعِيفًا (النساء: ﴿٧٦﴾)

١٦. وَلَأُضِلَّنَّهُمْ وَلَأُمَنِّيَنَّهُمْ وَلَءَامُرَنَّهُمْ فَلَيُبَتِّكُنَّ ءَاذَانَ ٱلْأَنْعَٰمِ وَلَءَامُرَنَّهُمْ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ ٱللَّهِ وَمَن يَتَّخِذِ ٱلشَّيْطَٰنَ وَلِيًّا مِّن دُونِ ٱللَّهِ فَقَدْ خَسِرَ خُسْرَانًا مُّبِينًا (النساء: ﴿١١٩﴾) سوێند بێت گومڕایان دەکەم و بە ئاوات و خەیاڵی درۆینە سەرگەرمیان دەکەم وە فەرمانیان پێ دەدەم جا بێگومان ئەوانیش گوێچکەی ئاژەڵەکان دەبڕن وە فەرمانیان پێ دەدەم ئەوسا ئەوانیش دروست کراوی خوا دەگۆڕن وە هەر کەسێك شەیتان بکات بە دۆستی خۆی بێجگە لەخوا ئەوە بێگومان زیانی لێ کەوتووە بە زیانێکی دیارو ئاشکرا.

١٧. گومڕاکردن.

١٨. هیواو خۆزگەی پوچ.

**١٩. گوێی ئاژەڵ پێ كونكردن و شەقكردن.**

**٢٠. گۆرینی دینی خوا.**

**٢١. گۆڕینی دروستكراوەكانی خوا.**

**٢٢. دۆڕاندن و ماڵوێراندن كردن و خستنە دۆزەخ ئەمانە هەمووی كردەوی شەیتانن، ئایا فیعلەن شەیتان بەهێز نیە كە بتوانێ ئەو هەموو كارانە بكا؟**

**٢٣. بتەكانیش هەر شەیتانەكانن لە راستیدا:** إِن يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ إِنَٰثًا وَإِن يَدْعُونَ إِلَّا شَيْطَٰنًا مَّرِيدًا (النساء: ١١٧) **جگە لەخوا نزاو هاوار ناكەن(نایپەرستن جگە لەخوا) تەنها لە چەند(بتێكی ناو لێنراوی) مێینەیە نەبێت وە نایپەرستن جگە لە شەیتانی یاخی و سەركەش نەبێ.**

**٢٤. شەیتان یاخی سەرسەختە بە بەڵگەی هەمان ئایەتی پێشوو.**

**٢٥. مەی خواردنەوە و دروستكردن و قومار و بتپەرستی و یانسیب هەموو ئەوانە كردەوەی شەیتانن:** يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ (المائدة: ٩٠) **ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە بێگومان ئارەق و قومار و ئەو بەردانەی كە كراون بە بت و ئەو پارچە دارانەی( كە بەكارئەهێنرێن بۆ دیاری كردنی بەش و چارەنووس) ئەوانە پیسن و لە كردەوەی شەیتانن كەواتە دوور كەونەوە لێی تا ڕزگاربن.**

**٢٦. دوژمنایەتی نانەوە.**

**٢٧. بوغز و كینە.**

**٢٨. لادان لە یادی خوا.**

**٢٩. لادان و بێئاگا کردن لە نوێژ هەمووی ئەوانە ویستی شەیتانە:** إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ فِي ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ (المائدة: ٩١) **بێگومان شەیتان هەر ئەوەی ئەویێ کە دوژمنایەتی و کینە و ڕق بخاتە ناوتانەوە بەهۆی ئارەق و قومارەوە وە بەرگریتان بکات لە یاد و باسی خوا و لە نوێژ کردن دەی ئایا ئێوە واز دەهێنن(لەو خراپیان) .**

**٣٠. شەیتان دەتوانێ شت لە بیر بەرێتەوە:** ... وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ ٱلشَّيْطَٰنُ فَلَا تَقْعُدْ بَعْدَ ٱلذِّكْرَىٰ مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ (الأنعام: ٦٨)

**٣١. دەرخستنی عەورەت و عەیب و عاری مرۆڤ:** فَوَسْوَسَ لَهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ لِيُبْدِيَ لَهُمَا مَا وُۥرِيَ عَنْهُمَا مِن سَوْءَٰتِهِمَا وَقَالَ مَا نَهَىٰكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةِ إِلَّآ أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنَ ٱلْخَٰلِدِينَ (الأعراف: ٢٠) **وەسوەسە پەیداکردن.**

**٣٢. سوێند خواردنی بەدرۆ:** وَقَاسَمَهُمَآ إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ (الأعراف: ٢١) **وە سوێندی بۆ خواردن وتی بێگومان من لە ئامۆژگارانی دڵسۆزی ئێوەم .**

**٣٣.** فَدَلَّىٰهُمَا بِغُرُورٍ فَلَمَّا ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ بَدَتْ لَهُمَا سَوْءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ ٱلْجَنَّةِ وَنَادَىٰهُمَا رَبُّهُمَآ أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَن تِلْكُمَا ٱلشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَآ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمَا عَدُوٌّ مُّبِينٌ (الأعراف: ٢٢) **سەرئەنجام بە خەڵەتاندن هانی دان جا کاتێک (لە بەرو بوومی) ئەو درەختەیان چەشت هەردووکیان عەیب و عەورەتیان دەرکەوت وە دەستیان کرد بەداپۆشینی خۆیان بەگەڵای (درەختانی) بەهەشت وە پەروەردگاریان بانگی هەردووکیانی کرد ئایا ئەو درەختەم قدەغە نەکرد لێتان وە ئایا پێم نەووتن کە بێگومان شەیتان بۆ ئێوە دوژمنێکی ئاشکرایە.**

**٣٤. بەرگ لێدارنین و ڕووتکردنەوە، سەرلێشێواندن:** يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ لَا يَفۡتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ كَمَآ أَخۡرَجَ أَبَوَيۡكُم مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ يَنزِعُ عَنۡهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوۡءَٰتِهِمَآۚ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمۡ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنۡ حَيۡثُ لَا تَرَوۡنَهُمۡۗ إِنَّا جَعَلۡنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوۡلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ (الأعراف: ٢٧) **ئەی نەوەی ئادەم با شەیتان فریوتان نەدات و نەتانخەڵەتێنێ هەرچۆنێ باوك و دایكتانی لە بەهەشت دەركرد لە حاڵێكدا پۆشاكەكەیانی لێ داكەندن بۆ ئەوەی عەیب و عەورەتیان (دەربخات) و نیشانیان بدات بەڕاستی شەیتان خۆی و دەستەكەی دەتان بینن لە جێگایەكەوە كە ئێوە ئەوان نابینن بەڕاستی ئێمە شەیتانەكانمان گێڕاوە بە دۆست و خۆشەویست بۆ ئەوانەی كە بڕوا ناهێنن.**

**٣٥. شەیتان دۆست و یاوەری بێباوەڕانە.**

**٣٦. ئەوان توانانی بینینی مرۆڤیان هەیە جیا لەوەی ئێمە ئەوان دەبینین:** يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ لَا يَفۡتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ كَمَآ أَخۡرَجَ أَبَوَيۡكُم مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ يَنزِعُ عَنۡهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوۡءَٰتِهِمَآۚ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمۡ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنۡ حَيۡثُ لَا تَرَوۡنَهُمۡۗ إِنَّا جَعَلۡنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوۡلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ (الأعراف: ٢٧) **ئەی نەوەی ئادەم با شەیتان فریوتان نەدات و نەتانخەڵەتێنێ هەرچۆنێ باوك و دایكتانی لە بەهەشت دەركرد لە حاڵێكدا پۆشاكەكەیانی لێ داكەندن بۆ ئەوەی عەیب و عەورەتیان (دەربخات) و نیشانیان بدات بەڕاستی شەیتان خۆی و دەستەكەی دەتان بینن لە جێگایەكەوە كە ئێوە ئەوان نابینن بەڕاستی ئێمە شەیتانەكانمان گێڕاوە بە دۆست و خۆشەویست بۆ ئەوانەی كە بڕوا ناهێنن.**

**٣٧. وەدەرنان لە بەهەشت، هەمان ئایەت بەڵگەیە.**

**٣٨. شەیتان زانای گومڕا پێشخۆی دەداو سەری لێدەشێوێنێ:** وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱلَّذِيٓ ءَاتَيۡنَٰهُ ءَايَٰتِنَا فَٱنسَلَخَ مِنۡهَا فَأَتۡبَعَهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ فَكَانَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ (الأعراف:

﴿١٧٥﴾) وە(ئەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)) بخوێنەرەوە بەسەریاندا هەواڵی ئەو کەسەی کە نیشانەکانی خۆمان پێ بەخشی کەچی خۆی لێ داڕنی (وە دەرچوو لە فەرمانی خوا) ئینجا شەیتان دوای کەوت بەهۆی ئەوەوە بوو بە یەکێك لە گومڕایان.

٣٩. توشکردنی مرۆڤ بە وەسوەسە و دنە دان و ئیحراجکردن: وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ سَمِيعٌ عَلِيمٌ (الأعراف: ﴿٢٠٠﴾) وە ئەگەر خەتەرەو خەیاڵ و وەسوەسەیەکت بۆ هات لەلایەنی شەیتانەوە یەکسەر پەنا بگرە بەخوا بەڕاستی هەر ئەو بیسەری زانایە.

٤٠. ئەهلی تەقواش شەیتان فریویاندەدا بەڵام ئەوان زوو بە ئاگا دێنەوە: إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ إِذَا مَسَّهُمْ طَٰٓئِفٌ مِّنَ ٱلشَّيْطَٰنِ تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُّبْصِرُونَ (الأعراف: ﴿٢٠١﴾) بەڕاستی ئەوانەی خواناس و پارێزکار بوون کاتێك خەتەرو وەسوەسەیەکیان لەشەیتانەوە پێ بگات یادی خوا دەکەن و خوایان بیر دەکەوێتەوە جا کوت وپڕ بەرچاویان ڕۆشن دەبێتەوە واتە ڕاستی دەدۆزنەوە.

٤١. هاوڕێ شەیتانەکان مرۆڤەکان گومڕاو سەر لێشێواوتر دەکەن: وَإِخْوَٰنُهُمْ يَمُدُّونَهُمْ فِى ٱلْغَىِّ ثُمَّ لَا يُقْصِرُونَ (الأعراف: ﴿٢٠٢﴾) وە برا (شەیتانە) کانیان یارمەتییان دەدەن لە گومڕایی بووندا پاشان کۆتایی ناهێنن و واز ناهێنن بۆ گومڕا کردنیان.

٤٢. شەیتان پیسی و کارتێکردن و فریودانی هەیە: إِذْ يُغَشِّيكُمُ ٱلنُّعَاسَ أَمَنَةً مِّنْهُ وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً لِّيُطَهِّرَكُم بِهِۦ وَيُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ ٱلشَّيْطَٰنِ وَلِيَرْبِطَ عَلَىٰ قُلُوبِكُمْ وَيُثَبِّتَ بِهِ ٱلْأَقْدَامَ (الأنفال: ﴿١١﴾) بیر بکەنەوە کاتێ(خوا) وەنەوزی بەسەرتاندا هێنا (بووە هۆی) دڵنیایی ئێوە لە لایەن(پەروەردگار) خۆیەوە بارانیشی لە ئاسمانەوە بۆ باراندن تا پاکتان بکاتەوە پێ ی و پیسی شەیتان(دوو

دڵی و گومان) لە ئێوە دوور بخاتەوە و پەیوەندی دڵەکانتان پتەو بکات وە بەو (بارانی) پێکانتان دامەزراو و جێگیر بکات.

٤٣. چەندین ساڵ پێغەمبرێکی لە زینداندا هێشتەوە بە هۆی لە بیربردنەوە: وَقَالَ لِلَّذِي ظَنَّ أَنَّهُۥ نَاجٍ مِّنْهُمَا ٱذْكُرْنِي عِندَ رَبِّكَ فَأَنسَىٰهُ ٱلشَّيْطَٰنُ ذِكْرَ رَبِّهِۦ فَلَبِثَ فِي ٱلسِّجْنِ بِضْعَ سِنِينَ (یوسف: ٤٢) و (یوسف) وتی بەوەی کە دەیزانی ڕزگاری دەبێ لەدوو بەند کراوەکە باسم بکە لای گەورەو پادشاکەت (کە بە ناهەق گیراوم) بەڵام شەیتان لە بیری بردەوە باسکردنی (یوسف) لای پادشای بکات بۆیە ماوەی چەند ساڵێك (یوسف) لە بەندیخانەدا مایەوە.

٤٤. دەس خستنە نێوان برایەتی و حەسودی پەیداکردن لە نێوانیاندا: مِنۢ بَعْدِ أَن نَّزَغَ ٱلشَّيْطَٰنُ بَيْنِي وَبَيْنَ إِخْوَتِيٓ إِنَّ رَبِّي لَطِيفٌ لِّمَا يَشَآءُ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ (یوسف: ١٠٠).

ئەو بەڵگانەی کە باسمانکردن لە سەر تواناو هێزی شەیتان و جنۆکە بەڵگە نین لەسەر ئەوەی کە دەتوانێ کاریگەری نەرێنی زۆریان هەبێ لەسەر مرۆڤ زیاتر لە چونە ناو لاشەی.

کەواتا چ بە قیاس المساوی بێ یان بە قیاس الاولی نابێتە بەڵگە لەسەر توانای شەیتان بەسەر مرۆڤە خراپ و لاوازەکانەوە کە بچێتە لاشەیانەوەو کاریگەری خراپی لە سەریان هەبێ؟

٤٥. شەیتان ئەگەر بە وەسوەسەش بوبێ توانی زۆربەی خەڵک بخاتە ئاگرەوە، هەڵبەتە تاوانەکانی تریش لە وەسوەسەوە دەست پێدەکەن و دەبنە بڕیارو کردەوە: وَقَالَ ٱلشَّيْطَٰنُ لَمَّا قُضِيَ ٱلْأَمْرُ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ ٱلْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوْتُكُمْ فَٱسْتَجَبْتُمْ لِي فَلَا تَلُومُونِي وَلُومُوٓا۟ أَنفُسَكُم مَّآ أَنَا۠ بِمُصْرِخِكُمْ وَمَآ أَنتُم بِمُصْرِخِيَّ إِنِّي كَفَرْتُ بِمَآ أَشْرَكْتُمُونِ مِن قَبْلُ

إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ (إبراهيم: ﴿٢٢﴾) کاتێ هەمووشت تەواو دەبێت بەهەشتیەکان دەچنە بەهەشتەوە و دۆزەخیەکان دەخرێنە دۆزەخەوە) شەیتان (بەفەرمانی خوا) دێتە قسەو (ڕوو بە پەیڕەوانی) دەڵێت: بەڕاستی خوا بەڵێنی ڕاست و دروستی پێ ڕاگەیاندبوون منیش بەڵێنی درۆو نادروستم پێدان و جا توانیم گومڕاتان بکەم و لە ڕێبازی ڕاست و وێڵتان بکەم، وەنەبێت من هیچ زۆرو دەسەڵاتێکم بەسەر ئێوەدا هەبووبێت، جگە لەوەی (بەوەسوە سەوخەتەرەو خەیاڵ) بانگم کردن (بۆ خوانەناسی و تاوان) ئێوەش بەدەممەوە هاتن و بەقسەتان کردم، ئیتر سەرزەنشت و لۆمەی من مەکەن، بەڵکو سەرزەنشت و لۆمەی خۆتان بکەن (کە ئاوا گێلانە، بێ بیرکردنەوە بەقسەتان کردم، ئەمڕۆ) من ناتوانم بەهاناو هاواری ئێوەوە بێم، ئێوەش ناتوانن بە هاناو هاواری منەوە بێن، بێگومان من باوەڕم نەبوو بەوەی کە کاتی خۆی منتان کردبوو بەشەریك و هاوبەش لە پێشدا، بەڕاستی ئەمڕۆ ستەمکاران سزای زۆر بەئێش دەدرێن.

٤٦. ئەگەر شەیتان کاریگەری هێزی نیە بۆچی دەبێ پەنا بە خوا بگرین لە کاتی گەورەترین بەندایەتیدا کە قورئان خوێندنە؟ : فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ (النحل: ﴿٩٨﴾) ئەی (موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)) کاتێ ویستت قورئان بخوێنی پەنا بگرە بە خوا لە شەیتانی دەرکراو لەبەزەیی خوا.

٤٧. شەیتان تەنیا توانای گومراکردنی بەسەر ئەوانەدا نیە کە ئیماندارن و پشتیان بە خوا بەستوە: إِنَّهُۥ لَيْسَ لَهُۥ سُلْطَٰنٌ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ (النحل: ﴿٩٩﴾) بە ڕاستی ئەو (شەیتان) دەسەڵاتی نی یە بەسەر ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و تەنها پشتیان بە پەروەردگاریان دەبەستن.

٤٨. توانی کارێکی سەرەکی لە بیر موساو هاوڕێکەی بەرێتەوە لەم سەفەرە دورو درێژەدا: قَالَ أَرَءَيْتَ إِذْ أَوَيْنَآ إِلَى ٱلصَّخْرَةِ فَإِنِّى نَسِيتُ ٱلْحُوتَ وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ إِلَّا

ٱلشَّيْطَٰنُ أَنْ أَذْكُرَهُۥ وَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِى ٱلْبَحْرِ عَجَبًا (الكهف: ٦٣) لاوەکە وتی لەبیرتە کاتێ چووینە پەنا بەردە گەورەکە (بۆ پشوودان) جا بەڕاستی من (لەوێ) ماسیەکەم لەبیر چوو هیچ شتێ ئەو (ماسیەکە) ی لەبیر نەبردمەوە کە باسی بکەم بۆت بێجگە لە شەیتان (ماسیەکە زیندوو بویەوەو) بە شێوەیەکی سەیر ڕێگای خۆی لە دەریاکە گرتەبەر.

٤٩. هیچ پێغەمبەرێک و نێردراوێکی خوا نەبوە کەویستبێتی قسە بکا شەیتان ویستویەتی قسەی خۆی بخاتە ناو قسەکانی و سەر لە خەڵک بشێوێنێ، بەڵام خوای گەورە وەحی خۆی پاراستوە: وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ وَلَا نَبِىٍّ إِلَّآ إِذَا تَمَنَّىٰٓ أَلْقَى ٱلشَّيْطَٰنُ فِىٓ أُمْنِيَّتِهِۦ فَيَنسَخُ ٱللَّهُ مَا يُلْقِى ٱلشَّيْطَٰنُ ثُمَّ يُحْكِمُ ٱللَّهُ ءَايَٰتِهِۦ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ (الحج: ٥٢) وە ئێمە لە پێش تۆ نەمان ناردووە هیچ ڕەوانە کراو یا پێغەمبەرێك مەگەر هەر کاتێ (قورئانی) دەخوێندەوە شەیتان گومانی دەخستە ناو خوێنراوەکەیەوە (تا خەڵك باوەڕی پێ نەهێنن) ئینجا خوا لای دەبات (پوچەڵی دەکاتەوە) ئەوەی شەیتان داوێتی بە گوێی خەڵکدا (لە کاتی قورئان خوێندنی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم)) پاشان خوا ئایەتەکانی خۆی دەچەسپێنێ وە خوا زانای کار دروستە.

٥٠. شەیتان دوای ئەوەی مرۆڤ فریودەدا بەڵام لە کاتی تەنگانەدا پشتی بەردەدا، کەواتە توانیویەتی فریوی بدات: لَّقَدْ أَضَلَّنِى عَنِ ٱلذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَآءَنِى وَكَانَ ٱلشَّيْطَٰنُ لِلْإِنسَٰنِ خَذُولًا (الفرقان: ٢٩) بەڕاستی ئەو (کەسەی کردم بە هاوەڵ) منی لە قورئان وێڵ کرد دوا ئەوەی قورئانم پێ گەیشت(و باوەڕم پێ هێنا) وە شەیتان هەمیشە پشت تێکەرو پشت بەردەرە بۆ ئادەمیزاد.

٥١. ڕازاندنەوەی خراپەکان و لادانیان لە ڕێی خوا: وَجَدتُّهَا وَقَوْمَهَا يَسْجُدُونَ لِلشَّمْسِ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ فَهُمْ لَا يَهْتَدُونَ (النمل: ٢٤) بینیم کە خۆی قەومەکەی سوجەدەیان دەبرد بۆ ڕۆژ لە

**جیاتی خوا، وە (شەیتان) کاروکردەوەکانیانی شیرین و جوان کردبوو لە بەرچاویان هەر بۆیە بە هۆی ئەوە لە ڕێگا لایان داوەو هیدایەتیان وەرنەگرتووە.**

**٥٢. کاتێک موسای کابای قیبتی کوشت وتی ئەوە لە کردەوەی شەیتانە، وە ئەو دوژمنێکی فریودەرو گومڕاکەرە، ئەم وتەیە خوای گەورە بۆمان دەگێڕێتەوە وەک پشتیوانیکردن نەوەک ڕەتکردنەوە:** وَدَخَلَ ٱلْمَدِينَةَ عَلَىٰ حِينِ غَفْلَةٍ مِّنْ أَهْلِهَا فَوَجَدَ فِيهَا رَجُلَيْنِ يَقْتَتِلَانِ هَٰذَا مِن شِيعَتِهِۦ وَهَٰذَا مِنْ عَدُوِّهِۦ فَٱسْتَغَٰثَهُ ٱلَّذِى مِن شِيعَتِهِۦ عَلَى ٱلَّذِى مِنْ عَدُوِّهِۦ فَوَكَزَهُۥ مُوسَىٰ فَقَضَىٰ عَلَيْهِ قَالَ هَٰذَا مِنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ إِنَّهُۥ عَدُوٌّ مُّضِلٌّ مُّبِينٌ (القصص: ﴿١٥﴾) **(موسا) لەکاتی غەفڵەتی خەڵکی شاردا خۆی کرد بە شەقام و بازاردا، بینی دوو پیاو شەڕ دەکەن، ئەمەیان لە تایفەی خۆیەتی و ئەمەشیان لە دەستەی دوژمنەکەیەتی (سەربازی فیرعەونە)، ئەوەی خزمی خۆی بوو موسای بینی هاواری لێکرد کە فریای بکەوێت و زاڵی بکات بە سەر دوژمنەکەیدا، موساش بەپەلە چوو بەدەمیەوە بۆکزەکی ماڵی بە کابرای (قبطی دا)و کوشتی، موسا پەشیمان بۆوە لەبەر خۆیەوە وتی: ئەم کارە شەیتان پێی کردم (من نەمدەویست بیکوژم) بە ڕاستی شەیتان دوژمنێکی گومڕاو ئاشکرایە.**

**٥٣. ئەوانەی هەڵدەگەڕێنەوە لە دین شەیتان ئەو کارەی بۆ جوانکردون:** إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱرْتَدُّوا۟ عَلَىٰٓ أَدْبَٰرِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْهُدَى ٱلشَّيْطَٰنُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَىٰ لَهُمْ (محمد: ﴿٢٥﴾) **بێگومان ئەو کەسانەی پاشەوپاش گەڕانەوە (لە ئایینەکەیان) لە پاش ئەوەی هەقیان بۆ ڕوون بوویەوە شەیتان خراپەکانیانی بۆ جوان و ڕازاوە کردبوون وە بە هیواو ئومێد فریوی دابوون.**

**٥٤. شەیتان دەتوانێ ئیمانداران خەمبار بکاو زیانیان پێبگەیەنێ ئەگەر خوا بیەوێ:** إِنَّمَا ٱلنَّجْوَىٰ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ لِيَحْزُنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَيْسَ بِضَآرِّهِمْ شَيْـًٔا إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ (المجادلة: ﴿١٠﴾) **بەڕاستی**

چپەی خراپ و نابەجێ هەر لە شەیتانەوەیە، تا ئەوانە غەمبار بکات کە باوەڕیان هێناوە، وە نەبێت ئەو چپەیە هیچ زیانێکیان پێ بگەیەنێت مەگەر ویستی خـوای لەسەر بێت، دەبا ئیمانداران هەر پشت بە خوا ببەستن تا لە زیان بە دوور بن.

٥٥. شەیتان بەسەر خەڵکدا زاڵدەبێ و شتیان لە بیر دەباتەوەو دەیان کاتە حیزب و گروپی خۆی، حیزب و گروپی شەیتانیش لە ئاگردایە: ٱسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ ٱلشَّيْطَٰنُ فَأَنسَىٰهُمْ ذِكْرَ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ حِزْبُ ٱلشَّيْطَٰنِ أَلَآ إِنَّ حِزْبَ ٱلشَّيْطَٰنِ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ (المجادلة: ١٩) ئەوانە شەیتان زاڵ بووە بەسەریانداو داگیری کردوون، بەو هۆیەوە یادی خوای لەبیر بردوون، ئا ئەوانە دەستە و تاقم و حزبی شەیتانن، ئاگاداربن کە بێگومان دەستە و تاقم و حزبی شەیتان خەسارەتمەند و زەرەرمەندن.

٥٦. شەیتان خەڵک بانگ دەکات بۆ ئاگر، وە فیعلەن خەڵکانی زۆریش دەخاتە ئاگرەوە کە زۆرینەن: وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُواْ بَلْ نَتَّبِعُ مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآ أَوَلَوْ كَانَ ٱلشَّيْطَٰنُ يَدْعُوهُمْ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ (لقمان: ٢١) کاتێکیش پێیان بوترێت شوێنی ئەو بەرنامەیە بکەون کە خوا ناردویەتی، ئەوە هەر شوێنی ئەو شتانە دەکەوین کە باو و باپیران و مامۆستایانمان پەیڕەوییان لی کردووە، ئایا ئەگەر شەیتانیش بانگی کردبن بۆ سزای داگیرساوی دۆزەخ، هەر پەیڕەوی دەکەن؟!

٥٧. شەیتان مرۆڤ کافر دەکاو خۆشی لێبەری دەکا، کەواتە کاری شەیتان بەس وەسوەسە نیە بەڵکو دەگاتە ئەندازەێ کافربونیش: كَمَثَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ إِذْ قَالَ لِلْإِنسَٰنِ ٱكْفُرْ فَلَمَّا كَفَرَ قَالَ إِنِّي بَرِيٓءٌ مِّنكَ إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ (الحشر: ١٦) نموونەی ئەم ناپاکانە وەك شەیتان وایە کە بە مرۆڤی وت: بێ بڕوابە جا کە

**بێ بڕوا بوو (شەیتان) وتی: بەڕاستی من بەریم لە تۆ بێگومان من لە خوای پەروەردگاری جیهانیان دەترسم.**

**٥٨. شەیتان زۆر لە ئێمە زیاتر شت دەبینێ:** وَإِذْ زَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ وَقَالَ لَا غَالِبَ لَكُمُ ٱلْيَوْمَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَإِنِّي جَارٌ لَّكُمْ فَلَمَّا تَرَآءَتِ ٱلْفِئَتَانِ نَكَصَ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ وَقَالَ إِنِّي بَرِىٓءٌ مِّنكُمْ إِنِّيٓ أَرَىٰ مَا لَا تَرَوْنَ إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ (الأنفال: ﴿٤٨﴾) **بیر بکەرەوە کاتێك کە شەیتان کردەوەکانیانی بۆ ڕازاندنەوە وە وتی: ئەمڕۆ هیچ کەس بەسەرتاندا زاڵ نابێ و بێگومان من پەنادەر(و پارێزەر) ی ئێوەم ئینجا کاتێ هەردوو دەستەکە ڕووبەڕووی یەکتر بوونەوە (شەیتان) پاشەوپاش بەدوای خۆی دا گەڕایەوەو وتی: بەڕاستی من بەریم لە ئێوە چونکە بەڕاستی ئەوەی من دەبینم ئێوە نایبینن بەڕاستی من لەخوا دەترسم و خوا زۆر تۆڵەی بەتین و سەختە.**

**٥٩. وە شەیتان قەناعەتی بە سەربازەکانی هێناوە کە سەریاندەخا و پەناو پارێزەریان دەبێ: بە بەڵگەی ئایەتی پێشوو.**

**٦٠. شەیتان خەڵک سەرگەردان و سەر لێشێواو دەکا:** قُلْ أَنَدْعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُنَا وَلَا يَضُرُّنَا وَنُرَدُّ عَلَىٰٓ أَعْقَابِنَا بَعْدَ إِذْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ كَٱلَّذِى ٱسْتَهْوَتْهُ ٱلشَّيَٰطِينُ فِى ٱلْأَرْضِ حَيْرَانَ لَهُۥٓ أَصْحَٰبٌ يَدْعُونَهُۥٓ إِلَى ٱلْهُدَى ٱئْتِنَا قُلْ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ وَأُمِرْنَا لِنُسْلِمَ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ (الأنعام: ﴿٧١﴾) **بڵێ ئایا بێجگەلە خوا هاوار بکەین (و بپەرستین) شتێك کە نە سوودمان پێ دەگەیەنێ نە زیان وە بەرەو دوا بگەڕێینەوە (پاش گەز بینەوە) لە پاش ئەوەی کە خوا ڕێنموونی کردین(بۆ ڕێگای ڕاست) ؟ بە وێنەی ئەو کەسەی کە شەیتانەکان سەریان لێ شێواندبێ لە زەوی دا سەر گەردان بێ و چەند هاوڕێیەکی هەبێ بانگی کەن بۆ ڕێ ی ڕاست (بڵێن) وەرە بۆ لای ئێمە(کەچی بە گوێیان نەکات) بڵێ بەڕاستی هەر ڕێنموونی خوا ڕێنموونی**

٧. أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ : كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ كَبَّرَ، ثُمَّ يَقُولُ : " سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ وَتَبَارَكَ اسْمُكَ وَتَعَالَى جَدُّكَ وَلَا إِلَهَ غَيْرُكَ ". ثُمَّ يَقُولُ : " لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ ". ثَلَاثًا. ثُمَّ يَقُولُ : " اللَّهُ أَكْبَرُ كَبِيرًا - ثَلَاثًا - أَعُوذُ بِاللَّهِ السَّمِيعِ الْعَلِيمِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ؛ مِنْ هَمْزِهِ وَنَفْخِهِ وَنَفْثِهِ ". ثُمَّ يَقْرَأُ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: رواه ابو داود ٧٧٥، الترمذي، ٢٣٤، النسائي ٨٩٩، ابن ماجه، ٨٠٤، الدارمي،١٢٧٥ ، احمد ١١٤٧٣.

همزە( همز) صرع و فێگرتن و تێکچونە دەڵێن ئەم فەرمودەیە لاوازە و کۆمەڵێک نەخۆشی تێدایە بۆیە ناکرێ بابەتی ئەوا گرنگ بە فەرمودەی لاواز بسەلمێنین.

٨. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: جَاءَتْ فَأْرَةٌ فَأَخَذَتْ تَجُرُّ الْفَتِيلَةَ، فَجَاءَتْ بِهَا فَأَلْقَتْهَا بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى الْخُمْرَةِ الَّتِي كَانَ قَاعِدًا عَلَيْهَا، فَأَحْرَقَتْ مِنْهَا مِثْلَ مَوْضِعِ الدِّرْهَمِ، فَقَالَ : " إِذَا نِمْتُمْ فَأَطْفِئُوا سُرُجَكُمْ ؛ فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَدُلُّ مِثْلَ هَذِهِ عَلَى هَذَا فَتُحْرِقُكُمْ ".حكم الحديث: صحيح

دەڵێن ئەو بەشەی کە لە بوخاری و مسلم دایە باسی جنۆکە و شەیتان ناکا، ئەگەر ئەم ڕاستبایا ئەو بەشەشیان ریوایەت دەکرد.

٩. أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " الْعَيْنُ حَقٌّ، وَيَحْضُرُ بِهَا الشَّيْطَانُ، وَحَسَدُ ابْنِ آدَمَ ".

دەڵێن ئەو فەرمودەیە دوو بەشە، بەشی یەکەمی گرفتی نیە و دروستە، بەڵام ویحضر بها الشیطان، ئەم زیادەیە مونکەرە و کاری پێ ناکرێ، بۆ ئەمەش بە بەڵگە ناشێ.

١٠. أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَكَرَ الطَّاعُونَ، فَقَالَ : " وَخْزٌ مِنْ أَعْدَائِكُمْ مِنَ الْجِنِّ، وَهِيَ شَهَادَةُ الْمُسْلِمِ ".حكم الحديث: أبو بلج مختُلف فيه، وباقي رجال الإسناد ثقات.

دەڵێن ئەم فەرمودەیەش قسەی لەسەر هەیە کە هۆکاری تاعون و نەخۆشی جنۆکەو شەیتان بێ، بۆیە بە بەڵگە ناشێ.

**ئەوانەی ئینکاری چونە لاشەی مرۆڤ بۆ جنۆکە دەکەن بەڵگە بە وتەی زانایان دێننەوە.**

**دەڵێن لە کۆن و تازەدا زانایانی زۆر هەبوون ئینکاری ئەوەیان کردوە کە شتی وا هەبێ ئەمانەش چەند نمونەیەکن:**

١. كان الامام مالك يرى ان الجان من امور الغيب التي لا تصرف للانسان فيها كما نقل عنه شهاب الدين القرافي في كتاب الذخيرة في أبواب الولاية والحسبة: (قال مالك: يُنهى الذي يزعم أنه يعالج المجانين بالقرآن؛ لأن الجان من الأمور الغائبة، ولا يعلم الغيب إلا الله) الذخيرة(57 /10 )

٢. وكذلك كان ناصر السنة الامام الحافظ الشافعي رحمه الله يرد شهادة من يزعم انه رأى جنيا او شيطانا لانه خالف نص كتاب الله في دعواه كما روى البيهقي في مناقب الشافعي -رحمه الله- عن الربيع بن سليمان أنه سمع الشافعي يقول «من زعم أنه يرى الجن رددنا شهادته.

٣. وكذلك الامام ابن حزم لم يكن معتزليا بل هو من كبار حفاظ السلف الصالح وكان لا يعتقد بتلبس الجن في جسد انسان وقد قال رحمه الله في رسالة من رسائله (اما كلام الشيطان على لسان المصروع، فهذا من مخاريق العزامين (أي الراقين الذين يستعملون العزائم أي الرقى). و لا يجوز إلا في عقول ضعفاء العجائز. و نحن نسمع المصروع يحرك لسانه بالكلام، فكيف صار لسانه لسان الشيطان؟ إن هذا لتخليط ما شئت. و إنما يلقي الشيطان في النفس يوسوس فيها، كما قال تعالى {يُوَسْوِسُ في صدور الناس} و كما قال تعالى {إلا إذا تَمَنَّى ألقى الشيطان في أُمْنِيَّتِهِ}. فهذا هو فعل الشيطان فقط. و أما أن يتكلم على لسان أحد، فحِمقٌ عتيقٌ و جُنونٌ ظاهرٌ. فنعود بالله من الخذلان و التصديق بالخرافات) ((228/3.

٤. وها هو إمام آخر وهو الحافظ ابن حبان وهو من كبار أئمة الحديث من عصر السلف الصالح ولم يكن معتزليا حاشاه ولم يكن مبتدعا وهذا هو فهمه للنص النبوي الشريف(الحمد لله الذي رد كيده الى الوسوسة) إذ بوب له قائلا في صحيحه(67/1) ؛ باب ذكر البيان بأن لا قدرة للشيطان على ابن آدم الا على الوسوسة فقط (وهل هنالك قول اشد وضوحا وصراحة من هذه الكلمات

النبوية الشريفة التي قصرت وحصرت فعل الشيطان في الوسوسة وهذا مطابق لقوله تعالى حكاية عن ابليس ( وما كان لي عليكم من سلطان الا ان دعوتكم فاستجبتم لي). والحديث الآنف الذكر اخرجه كذلك احمد في مسنده ( ح 3161) وقال العلامة أرنؤوط رحمه الله في حاشيته حديث صحيح على شرط الشيخين.

٥. وقال الامام الطحاوي في كتابه شرح الاثار (الناس إنما أمروا بالاستعاذة من الشيطان، فيما جعل له سلطان عليهم -وهي الوسوسة- لتحبيب الشر وتكريه الخير وإنساء ما يذكرون وتذكير ما ينسون. وأما إعثار دوابهم وإهلاك أموالهم، فلا سبب له فيها..)

٦. قال القاضي أبو يعلى الحنبلي رحمه الله في ( المعتمد في أصول الدين) : ( ولا سبيل للشيطان إلى تخبيط الإنسي كما كان له سبيل إلى سلوكه ووسوسته ، وما تراه من الصرع والتخبط والاضطراب ليس من فعل الشيطان لاستحالة فعل الفاعل في غير محل قدرته ، وإنما ذلك من فعل الله تعالى )..فهؤلاء ثلة من كبار فقهاء الأمة من السلف الصالح ومن بعدهم وهذه أقوالهم.

**٧. دەڵێن ئەوانە گەورە زانایانی سەرمەزهەب و فەرمودەناس و شەرعزانن، بەڵام بروایان بەوە نەبوە کە جنۆکە تحکم بە مرۆڤ بکاو بچێتە لاشەکەی.**

**٨. وە هەروەها موعتەزیلەکان جەهمیەکان .**

**٩. وە لە پێش ئەوان ئیبن عەباس وەک لە سەحیحی موسلم دا هاتوە کە دەڵێ پێغەمبەر نە قورئان بەسەر جنۆکەدا خوێندۆتەوە و نە ئەوانی بینیوە.**

**١٠. وە لە زانایانی سەردەم، ئیبن عاشور، محمد غەزالی، شەلتوت، قەرزاوی، هەموو ئەوانە قسەیان بە هەند وەردەگیرێ و قسەیان گوێ لێگیراوە.**

**بەڵگەیەکی تر:**

**ئەگەر چارەسەر کردنی ئەوانە راستەو پەیوەندت بە دینەوە هەیە، ئەی چی بەوانە دەڵێی کە لەسەر دەستی مەسیحی و جولەکە و ساحیرەکان چاکدەبنەوە؟!**

بەڵگەیەکی تر:

ئەوەی کە پێی دەوترێ واقع، ئەمە واقع نیە بەڵکو بە هۆی ئەو هەموو گرنگی پێدان بڵاوکردنەوانە کە لەسەر شاشەو تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان بڵاو دەبێتەوە، بۆیە واقعێکی سەپێنراوو دروستکراوە و خەڵکیان لاوازکردوە و متمانەیان بە خۆیان نەماوە.

بەڵگەیەکی تر:

دەڵێین راستە شەیتان و جنۆکە کاریگەری خراپیان هەیە ئێمە ئینکاری ئەوە ناکەین بەڵام ئەوە وەسوەسەو گومانی خراپە دەکرێ بە روقیەی شەرعی و ڕێگا شەرعیەکان و رونکردنەوەکان چارەسەر بکرێ نەوەک پەنا بۆ ئەوە بەرین بڵێین جنۆکە چۆتە ناو لاشەی مرۆڤ.

بەڵگەیەکی تر:

ئایا ئامانج لەو بابەتەدا چیە؟

ئەگەر ئامانج چارەسەر کردنە، دامان نا راستە بەڵام ئایا لێکەوتەی خراپیشی نییە لەوانە:

- ✓ لاواز بونی ئیمان بە خوا.
- ✓ گەرمکردنی بازاری ساحیرو فاڵچی و بە ناو مەلاو شێخەکان کە بەشێکی بەرچاویان قۆڵبری دەکەن.
- ✓ بازرگانی کردن بە ئاشکرا بەم بابەتەوە.
- ✓ زاناو نەزان خۆی لێ تاقیدەکاتەوە نەخۆش نازانی کامەیان ڕاستەو کامەیان ڕاست نیە.

- ✓ بڕوا بەهێزکردنی خەڵک زیار لە پێویست بە کاریگەری جنۆکە و وای لێهاتوە مرۆڤ لە ئەرکەکانی ڕادەکا دەڵێی خەتای جنۆکەیە.

بەڵگەیەکی تر:

ئایا خەڵک هاندەین بۆ ئەوەی بە شیوازی تر چارەسەری خۆیان بکەن باشتر نیە لە جیاتی ئەوەی بیانتۆقێنین و هەموو شت بۆ جنۆکە بگێرنەوە.

بەڵگەیەکی تر:

ئایا ناکرێ ئەوەی پێی دەڵێن مەس و دەست لێدان و چونە ناو لاشە حەڵەتی تر بن و پەیوەندی بەلایەنی دەرونیەوە هەبێ.

بەڵگەیەکی تر:

ئایا ناکرێ ئەمە تەحلیل بکەین بەوەی کە ئەمە دەیبینین کەسێک بە بێ ئاگای قسە دەکا دواتر کە چاک دەبێتەوە دەڵێ ئاگام لە هیچ نەبوە تەفسیری کەین بە جیهانی(اللاوعی) واتە ئەو کەسە ئەو قسانە دەڵێتەوە کە پێشتر تۆماری کردون، هەر وەک چۆن نەخۆش لە کاتی بەنجکراندا ئەو شتانە دەڵێ بە بێ ویستی خۆی، یان لە کاتی سەرخۆشیدا.

بەڵگەیەکی تر:

ئایا بۆچی تا ئێستا بابەتێکی ئەوا بەربڵاو لە ڕووی زانستیەوە پشتڕاست نەکراوەتەوە؟ لە کاتێکدا زانست لەوپەری پێشکەوتندا، وە زانستی پزیشکیدەرون زانی لێکدانەوەو تەفسیری تری بۆ ئەم دیاردە هەیە.

بەڵگەیەکی تر:

ئەی چی بەوانە بڵێین کە لە لای دکتۆر چاکدەبنەوە، ئایا دکتۆر جنیان لێدەردەکا؟!

**بەڵگەیەکی تر:**

**ئێمە بەوکارەمان پشتیوانی لە وەسوەسەو خورافیات و خەیاڵات دەکەین و بازاری جادوکەرو فاڵچیەکان خۆشدەکەین، ئایا دەکرێ ئەمە چارەسەر بێ یان دەرد؟**

## تەوەری حەوتەم

## وەڵام ئەوانە کە ئینکاری تلبس بونی ئینسان بە جنۆکە دەکەن

ئەوانەی ئینکاری دەکەن دەڵێن: خوای گەورە زۆر ڕێزی لە مرۆڤ ناوە و کردویەتی بە خەلیفە مرۆڤە لەوە گەورەترە بکەوێتە ژێر ڕکێفی جنۆکەو شەیتانەوە:

یەکەم بەڵگە کە ئەوان ئیستدلالی پێدەکەن قورئانی پیرۆزە:

دەڵێن ئەگەر ئەوە ڕاستبوایە واتە جنۆکە چوبایە ناو لاشەی مرۆڤەوە قورئانی پیرۆز بە ڕوونی باسی دەکرد مادام باس نەکراوە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە نیە، وە وەڵامی ئەو دوو ئایەتەشیان داوەتەوە کە دەفەرموێ : ﴿ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِى يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيْطَٰنُ مِنَ ٱلْمَسِّ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْبَيْعُ مِثْلُ ٱلرِّبَوٰاْ وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْ فَمَن جَآءَهُۥ مَوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ فَٱنتَهَىٰ فَلَهُۥ مَا سَلَفَ وَأَمْرُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ وَمَنْ عَادَ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ (البقرة: ٢٧٥) ئەوانەی کە دەخۆن سوو(الربا) ڕاست نابنەوە (لە گۆڕەکانیاندا) مەگەر چۆن کەسێ ڕاست دەبێتەوە کە شەیتان دەستی لێ وەشاندبێ (وە تووشی فێ بووبێ) ئەوە بەهۆی ئەوەوەیە، سوو خۆران وتیان: کڕین و فرۆشتن وەک سوو وایە لەکاتێکدا خوا ڕێ ی داوە بە کڕین و فرۆشتن بەڵام سووی قەدەغە کردووە ئینجا ئەو کەسەی پێی گەیشت ئامۆژگاری یەک لە پەروەردگاری یەوە ، وە خێرا دەستی لێ هەڵگرت ئەوا ئەوەی لەوەپێش وەری گرتووە بۆخۆیەتی( لە سوو خواردن) وە کاری ئەو حەواڵە بەخوایە، وە ئەوەی گەڕایەوە(بۆ سوو خواردن) ئا ئەوانە هاوڕێ ی ئاگرن تیا دەمێننەوە بە ئێجگاری.

دەڵێ ئەو باسی دوا ڕۆژە، وە مەرج نیە( مس) چونە ناو لاشە بێ هیچ بەڵگەی قورئانیمان نیە کە قورئان بەو واتایە بەکاری هێنابێ، بە تەنیا قسەی زانایان نابێتە بەڵگەی شەرعی لەسەر ئەو بابەتە هەستیارە.

وە ئایەتی سورەتی (ص) کە دەفەرموێ: وَٱذْكُرْ عَبْدَنَآ أَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلشَّيْطَٰنُ بِنُصْبٍ وَعَذَابٍ(ص: ﴿٤١﴾) ئەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم سەر گوزەشتەی بەندەی ئێمە - ئەیوب- یان بۆ باس بکە، کاتێك بانگی لە پەروەردگاری کردو وتی: بێگومان شەیتان توشی نەخۆشی و ئازاری کرووم.

توشبون بە نەخۆشی و ئازار مانای ئەوە نیە جنۆکە یان شەیتان چوبێتە ناو لاشەی چونکە ئایەتەکە ئەوە ناگەیەنێ، وە ئایەتەکەی تر بە ڕوونی باس لەوە دەکا و دەفەرموێ : أني مسني الضر، من زیانم توشهاتوە بەڵام نافەرموێ جنۆکە چۆتە ناو لاشەم.

**وەڵام :**

مەرج نیە هەرشتێک ڕاستەو خۆ نەوترێ ئەوە نەبێ یان ئەو واتایە نەگەیەنێ، چونکە قوڕئانی پیرۆز بەشێکی زۆری(ظنی الدلالة) جا ئەگەر وابێ نابێ زۆربەی ئایەتەکانی قوڕئان کار پێبکەین بەو بیانوە، ئایا ئەمە ڕاستە؟

لە قوڕئان پیرۆزدا وەک ئێمە نمونەمان پێ هێنایەوە کە پێویست ناکا دووبارەیان کەینەوە شەیتان جنۆکە کاری زۆریان پێدەکرێ، ئەوەی کە دەڵێ کاری شەیتان و جنۆکە تەنیا فریودان و وەسوەسەیە ئەوە ئەو کەسە قوڕئانی بە باشی نەخوێندۆتەوە.

ئەو کارانەی شەیتان و جنۆکە دەیانکەن بە پێی قورئان و فەرمودە زۆر مەترسیدارترن لە چونە ناو لاشەی مرۆڤ.

ئایا ئامانج چیە کە دەڵێن جنۆکە ناچێتە ناو لاشەی مرۆڤ؟ ئەگەر ئامانجیان ئەوەیە بڵێن ئەوانە کاریگەریان نیە ئەوە هەڵەیە چونکە کاریگەری شەیتان و جنۆکە قورئان فەرمودە پشتڕاستی کردۆتەوە.

وشەی(مس) راستە چەند واتایەکی هەیە، هەروەک ڕاڤەکارانی قورئان ئەو واتایەشیان وتوە بۆ نمونە ئیمامی تەبەری، ئیمامی رازی، ئیمامی سەمعانی، ئیمامی قورتبی و زانایانی زۆر بەڵکو زۆرینەی رەها ئەوایان تەفسیر کردوە وشەی(خبط) لێدانێکی توندی کە ناتوانێ ڕێک بروا بەملاولادا دەکەوێ.

وە هەروەها وشەی (مس) لەڕوی زمانەوانیەوە ئەو واتایە دەبەخشێ واتە شێت کردن و دەست لێوەشاندن و چونە ناو لاشە؟ دەبێ بۆ ئەمەش گوێ لە زانایانی زمانەوانی بگرین، لە لسان العرب/ ئیبن منظور ئەو واتایەی هێناوە بە مانای دەست لێوەشاندن و شێتکردن.

وە راغبی ئەسفەهانی دەڵێ بە کنایە بۆ شێتیش بەکارهاتوە وە هەمان ئایەتیشی بە بەڵگە هێناوەتەوەوە مناویش وتەی ئیمامی ئەسفەهانی هێناوە.

بابەتەکە ئەوەیە لە سەرچاوەکانی زمانی عەرەبی و شیعری عەرەبی کەلامی عەرەباندا ئەمە زۆرە .

بە تایبەت وشەی (مس) لە قورئاندا رونە :

1 . وە یەک کەوتن

2 . دەست لێدان

3 . جوتبون

4 . توشکردن

به تایبەت ئەو ئایەتە روونە لەوەی کە شەیتان دەستێکی وای لێوەشاندوە هێرو بێئاگای کردوەو نازانی بۆ کوێ دەڕوا.

وە ئایەتەکەی تریش باسی ئەیوب دەکا زۆر ڕوونە لە سزا دانی ئەیوب تا ئەو پەڕ بە ڕوونییش دەڵێ شەیتان توشی کردوم (فاعل)شەیتانە وە کە دەفەرموێ (مسنی الضر) دیارە زیان و نەخۆشیەکەش بە هۆی شەیتانەوەیە ئەمە واتایەکی زۆر ڕونە پێویست بە تەئویل ناکا وەک ئیبن عاشور کردویەتی.

ئەوەی ئەو دوو ئایەتە بەڕوونی باسی دەکەن سزادان و زیان پێگەیاندن و نەخۆشکردن و سەرلێشێواندن و شێتکردن و ڕێگا دەرنەکردنە وەک وشتر کە لاقان داوێ و ڕێگا داناگرێ.

پرسیارەکە ئەوەیە ئایا ئەم شتانە بەهۆی چییە؟ زۆربەیان دەڵێن کاریگەری جنۆکەو چونە ناو لاشەیەتی، ئەوانی تریش ناڵێن ئەو واتایانە نیە بەڵام بە هۆی چونە ناو لاشەوە نییە، وە هەشیانە دەڵێن شەیتان و جنۆکە هەر کاریگەری نییە بەسەر مرۆڤەوە، ئەم وتەیە زۆر سەیرو سەمەرەیە.

٢. ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز باس لە کاریگەری شەیتان دەکەن بەسەر مرۆڤەوە ئەمە زۆر ڕوونە وەک دەفەرموێ:

پەرستنی شەیتان: أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعْبُدُواْ ٱلشَّيْطَٰنَ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ (يس: ٦٠) مەگەر پەیمانم لەگەڵ نەبەستن ئەی نەوەکانی ئادەم کە بەندایەتی شەیتان نەکەن، چونکە دوژمنێکی ڕاستەقینەی ئێوەیە.

ئەگەر خەڵکێک نیە کە شەیتان دەپەرستن خوای گەورە بۆ نەهی لێدەکا؟

خەڵکێکی زۆری لە ئومەتانی پێشو گومڕا کردوە: وَلَقَدْ أَضَلَّ مِنكُمْ جِبِلًّا كَثِيرًا أَفَلَمْ تَكُونُواْ تَعْقِلُونَ (يس: ٦٢) کەسانێکی زۆر زۆری لە ئێوە گومڕا کرد. بۆ مێشکتان بەکارنەهێنا؟

**شەیتان بەڵێنی خۆی وە ڕاستگێرا کە زۆربەی بەندەکان گومرا دەکا:** وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُۥ فَٱتَّبَعُوهُ إِلَّا فَرِيقًا مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ (سبأ: ٢٠) **سوێند بەخوا بەڕاستی شەیتان گومانی خۆی لەواندا بەدی هێنا بۆیە ئیمانداران نەبێت هەموویان شوێنی شەیتان کەوتن.**

**وە بۆمان ڕووندەکاتەوە کە بۆچی شەیتان توانای بەسەر مرۆڤەکاندا هەیەو حیکمەت چیە وەک دەفەرموێ:** وَمَا كَانَ لَهُۥ عَلَيْهِم مِّن سُلْطَٰنٍ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يُؤْمِنُ بِٱلْءَاخِرَةِ مِمَّنْ هُوَ مِنْهَا فِى شَكٍّ وَرَبُّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ حَفِيظٌ (سبأ: ٢١) **وە شەیتان هیچ دەسەڵاتی بەسەر ئیمانداران دا نەبوو تەنها بۆ ئەوەی بزانرێت کێ باوەڕی بەڕۆژی دوایی هەیە و کێ لەوان دەربارەی( دواڕۆژ) لە گوماندایە وە پەروەردگارت (ئەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)) بەسەر هەموو شتێکدا چاودێرە.**

**لادانی خەڵک لەسەر ڕێگای ڕاستی خوای گەورە:** وَعَادًا وَثَمُودَاْ وَقَد تَّبَيَّنَ لَكُم مِّن مَّسَٰكِنِهِمْ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَكَانُواْ مُسْتَبْصِرِينَ (العنكبوت: ٣٨) **وە گەلی عاد و سەموودیشمان (لەناو برد) بەڕاستی (ئەو لەناو بردنە) ڕوون بۆتەوە بۆتان لە شوێنەوارە (وێرانە) کانیانەوە شەیتان کردەوە خراپەکانیانی بۆ ڕازاندبوونەوە بەهۆی ئەوەوە بەرگری کردن لە ڕێگای ڕاست لە کاتێکدا ئەوان توانای بیرکردنەوەیان هەبوو (ژیر) بوون.**

**لادانی مرۆڤ لە ڕێگای ڕاست کاری شەیتانە، لەوانەیە بوترێ ئاخر شەیتان جیاوازە لە جنۆکە شەیتان کاریگەری هەیە بەڵام جنۆکە ئەو توانایەیی نییە. بەڵام ئەوە وانیە چونکە شەیتان بە هۆی سەربازەکانیەوە ئەو کارانە دەکا، وە هەروەها بازی توانای جنۆکەش کراوە، کە ئەوانیش دەتوانن گومڕا بکەن خراپە جوانبکەن، بەسەر خەڵکدا زاڵبن وە خوای گەورە دەفەرموی:** وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ نُقَيِّضْ لَهُۥ شَيْطَٰنًا فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٌ (الزخرف: ٣٦) **وە هەر کەس پشت لە یادی خوا**

**هەڵکات شەیتانێکی بۆ ئامادە دەکەن کە هەمیشە لەگەڵی بێ و لێی جیا نەبێتەوە.**

وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ (الزخرف: ٣٧) **وە بێگومان ئەوانە (شەیتانەکان) لە ڕێگای ڕاست بەرگری یان دەکەن واش دەزانن بە بێگومان هەر ئەوانن ڕێنووین.**

**لەوانەیە بوترێ ئەوە تەنیا بۆ کافرانە ئەمە ڕاست نیە، ئایا ئەیوب پێغەمبەر نەبو کە ئەزیەتیانداو نارەحەتیان کرد، وە هەر ئیمانداریکیش بە ئەندازەی تاوانکردنی لە بەرامبەر شەیتان و جنۆکەدا لاواز دەبێ خوای گەورەش فەرمویەتی توانای شەیتان بەسەر ئەوانەدا نییە کە بروادارن و پشتیان بە خوا بەستوە، ئەی ئەگەر بڕوادارێک پشتی بە خوا نەبەستبێ و ترسنۆک بێ ئەو ئەوکات بەزەلەیان دەباو هەڵەیان پێدەکا:** إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَلَّوْاْ مِنكُمْ يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ إِنَّمَا ٱسْتَزَلَّهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ بِبَعْضِ مَا كَسَبُواْ وَلَقَدْ عَفَا ٱللَّهُ عَنْهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ (آل عمران: ١٥٥) **بەڕاستی ئەوانەی پشتیان هەڵکرد لەناوتاندا لەو ڕۆژەی کە هەردوو کۆمەڵ گەیشتن بەیەک (لە ئوحود دا) بێگومان تەنها شەیتان هەڵی خلیسکاندن بەهۆی هەندێ لەو گوناهانەی کەلەوەبەر کردبوویان سوێند بێ بێگومان خوا لێ یان خۆشبوو چونکە بەڕاستی خوا لێبووردەی پەلەنەکەرە لە تۆڵە سەندن دا.**

**خوای گەورەش ئاگادارمان دەکاتەوە لە شەیتان و وەچەکانی:** وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُواْ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِۦٓ أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِى وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّۢ بِئْسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلًا (الكهف: ٥٠)

**بیریان بهێنەرەوە کاتێك بە فریشتەکانمان وت سوژدە بەرن بۆ ئادەم ئەوانیش هەموو سوژدەیان برد جگە لە ئیبلیس نەبێت کە لە پێری پەرییەکان بوو بۆیە لە فەرمانی پەروەردگاری دەرچوو دەی ئایا ئێوە (ئەی ئادەمیزادەکان) ئەو و نەوەی**

دەکەن دۆست و پشتیوانی خۆتان لە جیاتی من لە کاتێکدا کە ئەوان دوژمنی ئێوەن ئای چ گۆڕینەوەیەکی خراپە بۆ ستەمکاران.

نافەرموێ ( هو لكم عدو) بەڵکو دەفەرموی (وهم لكم عدو).

خوای گەورەش ئەم زاڵبون و گومڕابونەی باس کردوە، هیچ مانع نییە کە یەکێک لە ڕێگاکانی ئەم گومڕاکردنە چونە ناو لاشەو تحكم بێ بە مرۆڤ.

٣. ئەگەر باسی فەرمودە بکەین ئەوە لەوێدا باسەکە ڕونترە تا ئەندازەیەک:

جەرەیانی شەیتان لە ناو خوێنی مرۆڤ: إن الشيطان يجري من إبن آدم مجرى الدم ، أو مبلغ الدم ئەم فەرمودە ڕواڵەتەکەی ئەوەیە کە دەچێتە لاشەی مرۆڤەوە، وە دەشکرێ کینایە بێ لە بری وەسوەسە، بەڵام مانع ش نیە کە هەردووکی بێ، هەم وەسوەسە، هەم چونە ناو لاشە، خۆ نەفی کردنەکەی ئەولاتر نییە لە ئیسپاتکردنەکەی.

شەیتان لە ناو لوتی مرۆڤدا دەمێنێتەوە: يبيت فى خياشومه أو خيشومه، ئەی دەبێ چۆن تەئویلی ئەمە بکەین، کە ئەمە ڕوونە دەفەرموی لە لوتی مرۆڤدا دەمێنێتەوە.

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا وَقَدْ وُكِّلَ بِهِ قَرِينُهُ مِنَ الْجِنِّ ". قَالُوا : وَإِيَّاكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ ؟ قَالَ : " وَإِيَّايَ، إِلَّا أَنَّ اللَّهَ أَعَانَنِي عَلَيْهِ فَأَسْلَمَ، فَلَا يَأْمُرُنِي إِلَّا بِخَيْرٍ ". روار مسلم،٢٨١٤. باشه ٠قرين) چ دەگەیەنی واتە ئەوەی بەردەوام لە گەڵدایە، هەمنشینە، هاوڕێ یە، هەروەک قەرینی خێریش هەیە کە فریشتەیە.

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " إِنَّ إِبْلِيسَ يَضَعُ عَرْشَهُ عَلَى الْمَاءِ، ثُمَّ يَبْعَثُ سَرَايَاهُ، فَأَدْنَاهُمْ مِنْهُ مَنْزِلَةً أَعْظَمُهُمْ فِتْنَةً، يَجِيءُ أَحَدُهُمْ فَيَقُولُ : فَعَلْتُ كَذَا وَكَذَا. فَيَقُولُ : مَا صَنَعْتَ شَيْئًا. قَالَ : ثُمَّ يَجِيءُ أَحَدُهُمْ فَيَقُولُ : مَا تَرَكْتُهُ حَتَّى فَرَّقْتُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ امْرَأَتِهِ. قَالَ : فَيُدْنِيهِ مِنْهُ، وَيَقُولُ : نِعْمَ أَنْتَ ". قَالَ

الْأَعْمَشُ : أُرَاهُ قَالَ : فَيَلْتَزِمُهُ.، رواه مسلم،٢٨١٣ ئەو شەیتانەی کە دەتوانێ ژن و مێرد لێکجیا بکاتەوە ئایا ئەمە کارێکی گەورە دەسەڵاتدارانە نیە؟، شەیتان لە ڕێی سەربازەکانییەوە ئەوە دەکا، فەرمودەکە ڕوونە.

أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ خَرَجَ مِنْ عِنْدِهَا لَيْلًا، قَالَتْ : فَغِرْتُ عَلَيْهِ، فَجَاءَ فَرَأَى مَا أَصْنَعُ، فَقَالَ : " مَا لَكِ يَا عَائِشَةُ، أَغِرْتِ ؟ " فَقُلْتُ : وَمَا لِي لَا يَغَارُ مِثْلِي عَلَى مِثْلِكَ ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " أَقَدْ جَاءَكِ شَيْطَانُكِ ؟ " قَالَتْ : يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَوَمَعِيَ شَيْطَانٌ ؟ قَالَ : " نَعَمْ ". قُلْتُ : وَمَعَ كُلِّ إِنْسَانٍ ؟ قَالَ : " نَعَمْ ". قُلْتُ : وَمَعَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ ؟ قَالَ : " نَعَمْ، وَلَكِنْ رَبِّي أَعَانَنِي عَلَيْهِ حَتَّى أَسْلَمَ ".رواه مسلم.٢٨١٥، پێغەمبەری خوا وتی بە عائشە ئەوە شەیتانەکەت هاتوە بۆ لات؟ ئەویش وتی: ئایا شەیتانم لە گەڵدایە؟ فەرموی بەڵێ هەموو کەس شەیتانی لەگەڵدایە وە هەتا لە گەڵ پێغەمبەری خواش بەڵام هی ئەو مسوڵمان بوە بە خێر نەبێ فەرمان ناکا، وابزانم فەرمودەکە زۆر ڕوونە.

پەنادانی پێغەمبەری خوا بۆ حەسەن و حوسەین لە شەیتان، بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر کاریگەری شەیتان، هەروەک چۆن ئیبراهیم ئیسماعیلی و ئیسحاقی پانا دەگرد بە خوا لە شەیتان : عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ : كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُعَوِّذُ الْحَسَنَ وَالْحُسَيْنَ وَيَقُولُ : " إِنَّ أَبَاكُمَا كَانَ يُعَوِّذُ بِهَا إِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ : أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّةِ مِنْ كُلِّ شَيْطَانٍ وَهَامَّةٍ ، وَمِنْ كُلِّ عَيْنٍ لَامَّةٍ ." رواه البخاري،٣٣٧١ ، ئەم فەرمودەیە ڕوونە لەسەر کاریگەری شەیتان و جنۆکە دەنا دوو لە گەورەترینی پێغەمبەران مناڵەکانیان پەنا نەدەدا لە شەیتان.

کەواتە بێجگە لەم دوو جۆرە مارە لە ماڵاندا بە بێ ئاگادارکردنەوە دەکوژرێن، ئەوانیش ئەوەی کلک ئەستورە دەڵێی بڕاوەیە، جۆری دووەم ئەوەی دووخەتی ڕەشی لەسەر پشتە: عَنْ عُمَرَ بْنِ نَافِعٍ ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ : كَانَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ يَوْمًا عِنْدَ هَدْمٍ لَهُ، فَرَأَى وَبِيصَ جَانٍّ، فَقَالَ : اتَّبِعُوا هَذَا الْجَانَّ فَاقْتُلُوهُ. قَالَ أَبُو لُبَابَةَ الْأَنْصَارِيُّ : إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ قَتْلِ الْجِنَّانِ الَّتِي تَكُونُ فِي الْبُيُوتِ، إِلَّا الْأَبْتَرَ وَذَا الطُّفْيَتَيْنِ ؛ فَإِنَّهُمَا اللَّذَانِ يَخْطِفَانِ الْبَصَرَ،

وَيَتَّبِعَانِ مَا فِي بُطُونِ النِّسَاءِ. رواه مسلم،٢٢٣٣ ئەم فەرمودەیە بە ڕوونی پێمان دەڵێ کە جنۆکە لە ماڵاندا لە سەر شێوەی مار خۆیان دەنوێنن ئەمەش جۆرێکە لە سەر توانای جنۆکە بۆ خراپە کردن و ترساندن.

بە پێی ئەم فەرمودەیە عەبدوڵای کوڕی عومەر شوێنەواری جنۆکەی بینیوە جا روناکی بێ، یان یان لە شێوەی پێستی مار بێ، چونکە جنۆکەکان لەسەر شێوەی خۆیان نابینرێن: عَنْ عُمَرَ بْنِ نَافِعٍ ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ : كَانَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ يَوْمًا عِنْدَ هَدْمٍ لَهُ، فَرَأَى وَبِيصَ جَانٍّ، فَقَالَ : اتَّبِعُوا هَذَا الْجَانَّ فَاقْتُلُوهُ. قَالَ أَبُو لُبَابَةَ الْأَنْصَارِيُّ : إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ قَتْلِ الْجِنَّانِ الَّتِي تَكُونُ فِي الْبُيُوتِ، إِلَّا الْأَبْتَرَ وَذَا الطُّفْيَتَيْنِ ؛ فَإِنَّهُمَا اللَّذَانِ يَخْطِفَانِ الْبَصَرَ، وَيَتَّبِعَانِ مَا فِي بُطُونِ النِّسَاءِ. رواه مسلم، ٢٢٣٣

کەواتە بە پێی فەرمودەکان هیچ ڕێگریەک نییە کە جنۆکە ببێتە قەرین، یان بچێتە خوێن، یان بچێتە ناو لوت، یان ببێتە مار، یان فەرمانی خراپ بە مرۆڤ بکا...

ئەم فەرمودەیە یەکلاوە کەرەوەبو ئەگەر کێشەی سەنەدی نەبوایەو پچڕانی تێدا نەبا: لأَنَّ امْرَأَةً جَاءَتْ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَعَهَا صَبِيٌّ لَهَا بِهِ لَمَمٌ . فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " اخْرُجْ عَدُوَّ اللَّهِ، أَنَا رَسُولُ اللَّهِ ". قَالَ : فَبَرَأَ فَأَهْدَتْ إِلَيْهِ كَبْشَيْنِ، وَشَيْئًا مِنْ أَقِطٍ ، وَشَيْئًا مِنْ سَمْنٍ. قَالَ : فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " خُذِ الْأَقِطَ، وَالسَّمْنَ، وَأَحَدَ الْكَبْشَيْنِ، وَرُدَّ عَلَيْهَا الْآخَرَ ".حكم الحديث: إسناده ضعيف لانقطاعه مسند أحمد ،١٧٥٤٩ .

ئەم فەرمودەیە کە باس لەوە دەکا ئافرەتێک هاتوە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا علیه الصلاة والسلام وە مناڵێکی پێبوو کە وتی توشی فێ دەبێ لە هەندێک ریوایەتدا ڕۆژی دوو جار، پێغەمبەری خوا مناڵەکەی لێوەرگرت و فەرموی: بڕۆ دەر ئەی دوژمنی خوا من رەسول الله م، مناڵەکە چاکبۆوە و بە دیاری دوو بەران و کەشک و کەرەی بۆ پێغەمبەری خوا هێنابوو.

پێغەمبەری خوا دوو بەرانەکەی لێوەرگرت و کەرەو کەشکەکەشی پێدایەوە ئەم فەرمودەیە ئیمام ئەحمەدو حاکم و دارەمی و هیتریش ڕیوایەتیان کردوە بەشێک لە زانایان بە لاوازیان داناوەو بەشێکیان بە حسن یان داناوە لە وانە :

- ✓ ئیمامی هەیسەمی دەڵێ رجاله رجال الصحيح.
- ✓ بحاکم بە سەحیحی داناوە و زەهەبیش موافیقی بوە.
- ✓ بوسەیری لە مختصر الاتحاف دا هێناویەتی و دەڵێ رجاله ثقات.
- ✓ ئەلبانی لە سیلسیلەی سەحیحەکەیدا هێناویەتی.
- ✓ وە زۆری تریش لە هاوچەرخەکان بە حسن یان سەحیحیان داناوە.

بەڵام گومان لەوەدا نیە کە فەرمودەکە کێشەی لە سەرە لە روی سەنەدەوە، بەڵام لە رووی واتاوە پێچەوانەی قورئان نیە، وە پێچەوانەی فەرمودە سەحیحەکان نیە، بۆیە دەکرێ بە بەڵگە بهێنرێتەوە بۆ ئەو بابەتە.

٤. وتەی زانایان:

یەکی تر لەسەر بەڵگەی ڕاستی دەسەڵاتی شەیتان وجنۆکە بە سەر مرۆڤداو چونە ناو لاشەی وتەی زانایانە، کە زۆبەی زانایان بە درێژای مێژو باسیان لێوە کردوە، وە بە بۆچونی زۆربەی ئەهلی سونەیان زانیوە، ئەبی حەسەنی ئەشعەری، ئیبن تەیمیە، ئیبن قەیم زۆر لە زانایانی تر ئەم ڕایە نەقڵ دەکەن، ئەگەر قەرار ڕاستی ئەم مەسەلە بە زۆری ژمارە بێ ئەوە ژمارەی ئەوکەسانەی دەڵێن جنۆکە دەچێتە ناو لاشەی مرۆڤەوە ژمارەیان زیاترە هەرچەندە ئەوە پێوەر نیە، حەق هەر هەقە بە شوێنکەوتوانیشی ژمارەیان کەمبێ، خراپەو ناهەق بە شوێن کەوتووی زۆری نابێتە حەق و ڕاستی.

ئیبن عەباس كە دەفەرموێ پێغەمبەری خوا جنۆكەی نەدیوەو قسەشی لە گەڵ نەكردون ئەوە دژە بە قسەی كەسی لە خۆی بە ئەزمونتر لەو بارەوە كە عبداللەی كوری مەسعودە، وە ئیبن مەسعود لە مەكەوە لە گەڵ پێغەمبەردا ژیاوە، ئیبن عباس تەنیا لە دوای فەتحی مەكە پێغەمبەری بینوە پێشتر مناڵ بوە.

ئیمامی شافعی كە دەڵێ هەر كەس بڵێ جنۆكەم دیوە شایەتی ڕەتدەكەینەوە وتەكەی تەواوە چونكە لەسەر شێوەی خۆی نابینرێ، بەڵام ئەگەر واتێبگەین كە جنۆكە بە هیچ شێوەو وێنەیەک نابینرێ شافعی وای نەوتوە، وە ئەگەر واشی وتبێ كە نەیوتوە ئەوە پێچەوانەی فەرمودەیە.

ئەوانەش كە دەڵێن توانای شەیتان بەس وەسوەسەیە ئەوە تەنیا بەشێک لە توانای شەیتان و جنۆكە وەسوەسەیە، یان بیدایەت لە وەسوەسە دەست پێدەكات تا دەگاتە قۆناغەكانی تاوان پێكردن و گومڕاكردن و كافر كردن و خستنە ئاگرەوە.

## جادو یەکێکە لە بەڵگەکانی توانای جنۆکە بەسەر مرۆڤدا و چونە ناو لاشەی مرۆڤ

١. سەرەتا جا(سحر) چییە؟

پێناسەی جۆراو جۆر هەیە بۆ بۆ جادو :

لە رووی زمانەوانی جادو واتە: کل ما لطف مأخذه ودق، ومنه قول النبى صلى الله عليه وسلم: عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُ قَدِمَ رَجُلَانِ مِنَ الْمَشْرِقِ فَخَطَبَا، فَعَجِبَ النَّاسُ لِبَيَانِهِمَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " إِنَّ مِنَ الْبَيَانِ لَسِحْرًا ". أَوْ : " إِنَّ بَعْضَ الْبَيَانِ لَسِحْرٌ "رواه البخارى ، ٥٧٦٧. جادو هەرشتێک کە گرتنی وردو کاریگەر بێ، واتە ڕەوانبێژی و کاریگەری وەک جادو وایە: ئەو کاتە ئەوەی فەرموو کە دوو وتار بێژەکە سەری خەڵکیان سەر سوڕماندوە، وسحره أى خدعه، واتە فریوی دا، بەم واتایەش لە قورئانی پیرۆزدا هاتوە: قَالُوٓاْ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلۡمُسَحَّرِينَ (الشعراء: ١٥٣) وتیان (بە صاڵح(علیه السلام)) تۆ تەنها یەکێکی لە جادوو لێکراوان و فریو خواردوان ( أى من المخدوعين)

جادو لە ڕووی شەرعییەوە:

بەیزاوی لە پێناسەی جادو دەڵێ: المراد بالسحر ما يستعان فى تحصيله التقرب إلى الشيطان مما لا يستقل به الانسان، وذلک لا يحصل إلا لمن يناسبه فى الشرارة و خبث النفس، مەبەست لە جادو ئەنجامدانی ئەو شتەیە کە پێی لە شەیتان نزیک بییەوە، بەوەی کە تەنیا بە مرۆڤ ناکرێ، ئەم جادوەش بە دەست نایا مەگەر بۆ ئەو کەسە نەبێ کە گونجاوە لە گەڵ شەیتان لە ڕووی خراپەو دەرون پیسییەوە.

قەلیونی دەڵێ : السحر مزاولة النفوس الخبيثة لأقوال أو أفعال ينشأ عنها أمور خارقة للعادة.

جادو ئەوەیە: دەرون پیسەکان سود وەردەگرن و بەکار بەری قسەو کردارێکن کە دەبێتە هۆی هەندێک کار کە پێچەوانەی کاری ئاساییە.

حەنابیلەکان دەڵێن: عقد ورقى وكلام يتكلم به،أو يكتبه، أو يعمل شيئا يؤثر في بدن المسحور ،أو قلبه ،أو عقله من غير مباشرة له.

جادو بریتییە لە چەند گرێ و دوعاو وتەیەک کە جادوکەر دەیڵێ، یان دەینوسێ، یان شتێک دەکات کاردەکاتە سەر لاشەی جادو لێکراوەکە، یان دڵی، یان ژیری، بە ناڕاستەوخۆ.

کەواتە بە پێی ئەم پێناسانە جادو ئەنجامدانی ئەو کارانەیە کە کاردەکاتە سەر جادو لێکراوەکە، جا چ بە هۆی وتە یان دوعا، یان تەڵەسمەکان، یان خواردنەوە یان هەرشتێک کە کار بکاتە سەر لاشەی جادولێکراوەکە بە گشتی یان دڵی یان ژیری.

٢. زۆر وشە هەیە هاوواتای جادویە وەک:

- ✓ شعوذة: دەست سوکییە وەکارتێکردنە وەک جادو وا لە کەسەکە دەکا شتەکە وەک خۆی نەبینێ.
- ✓ نشرة: هەڵوەشاندنەوەی جادوییە بە ڕێگای جادو.
- ✓ عزیمة: سوێند خواردنە لەسەر چەند ناوێک کە جادو کەرەکان پێ یان وایە ناوی فریشتەو ناوی پیرۆزە کە سولەیمان بە کۆمەڵێک جنۆکەی تایبەتی سپاردوە، وە ئەگەر جادوکەرەکە سوێندی لە جنۆکەکە خوارد کارەکەی بۆ دەکا.
- ✓ رقیة: کۆمەڵێک وشەو نزایە لە کاتی بەکارهێنانیان کەسەکە چاک دەبێتەوە یان کارەکەی بۆ دەکرێ.

- ✓ طلسم: چەند ناوێکی تایبەتن پەیوەندیان هەیە بە ئەستێرەکانەوە کە دەخرێنە ناو کان(معدن) یان هەر مادەیەکی ترەوە، پێ یان وایە شوێنەواری تایبەتی لێدەکەوێتەوە بە پێی ئەوەی کە کەسەکە ئەم جۆرە جادوە دەکا.
- ✓ أوفاق: ئەویش چەند ژمارەیەکە بە شێوەی ئەندازیاری دادەنرێ و بە کاردەهێنرێ، پێ یان وایە کەسێک بیخاتە سەر کاغەزێک و هەڵی بگرێ ئەوە مناڵبون ئاسان دەکا، یان سوپایەک بەسەر سوپایەکی تردا سەردەخا، یان زیندانی ڕزگار دەکا.
- ✓ تنجيم: واتە ڕوانین بۆ ئەستێرە، بە تێڕوانین بۆ شێوازی گەردونی (فلکی) لە ڕوداوە زەمینیەکان تێدەگەن بە گومانی خۆیان.

**حەقیقەتی جادو:**

- ✓ لە کۆنەوە تا ئێستا ڕاجیایی هەبوە لە نێوان زانایانی ئیسلام و فەلاسیفەکان، ئایا جادو کاریگەری هەیە یان نا؟
- ✓ بەشێک لە گروپە ئیسلامیەکان وەک: موعتەزیلە، ئەبەبەکری ڕازی حەنەفی ناسراو بە (الجصاص)، ئەبو جەعفەری ئیسترابادی، بەغەوی لە شافعیەکان، پێ یان وایە کە جادو تەنیا فریودان و فێڵ لە چاو کردنە، دەنا هیچ حەقیقەتێکی نییە، کۆمەڵێک بەڵگەشیان بۆ ئەوە هێناوەتەوە وەک:
- ✓ قَالَ أَلْقُواْ فَلَمَّآ أَلْقَوْاْ سَحَرُوٓاْ أَعْيُنَ ٱلنَّاسِ وَٱسْتَرْهَبُوهُمْ وَجَآءُو بِسِحْرٍ عَظِيمٍ (الأعراف: ١١٦) ئەم ئایەتە پێماندەڵێ کە چاوی خەڵکیان فریوداوە نەوەک بە ڕاستی پەت و دارعەساکانیان کردبێتە مار.
- ✓ قَالَ بَلْ أَلْقُواْ فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَىٰ (طه: ٦٦) مووسا فەرمووی نەخێر ئێوە (لەپێشەوە) فڕێ ی بدەن (ئەوانیش فڕێ یاندا) جا لەناکاودا گوریس و دار دەستەکانیان وا خەیاڵدەکرا کە ئەمانە مارن

دەڕۆن بە خێرایی، کەواتە جوڵەی ئەو مارانە تەنیا خەیاڵی چاوی بینەران بوە دەنا دارەکان هەرلە جێگای خۆیانبون و هیچیان بەسەر نەهاتوە.

- ✓ و دەرکەوتوە جادو هونەری دەست سوکی و فێڵکردنەو هیچی تر.
- ✓ وە دەڵێن لە ڕووی زانستی ئەمە پشتڕاست ناکرێتەوە.
- ✓ وە دەبینی جادو گەرو فاڵچیەکان زۆربەیان هەژارن و چاو لە دەستی خەڵکن ئەی بۆ دارو بەرد ناکەن بە پارەو خەڵکی پێ فریو بدەن.
- ✓ زۆربەی زانایان بڕوایان وایە جادو ڕاستەو کاریگەریشی هەیە.

**چەندین بەڵگەیان بۆ ئەم وتەیە هێناوەتەوە لەوانە:**

**أ.** هەر ئایەتی یەکەم کە کۆمەڵەی یەکەم بە بەڵگەیان هێناوەتەوە کە دەفەرموێ: قَالَ أَلْقُواْ فَلَمَّآ أَلْقَوْاْ سَحَرُوٓاْ أَعْيُنَ ٱلنَّاسِ وَٱسْتَرْهَبُوهُمْ وَجَآءُو بِسِحْرٍ عَظِيمٍ (الأعراف: ١١٦) مووسا وتی: ئێوە بیهاوێژن(ئەوەی پێتانە) ئینجا کاتێ(ئەوەی پێیان بوو لە جادوو) فڕێ یان دا چاو بەستیان لە خەڵك کرد و ترسێکی گەورەیان خستە دڵیانەوە وە جادوویەکی گەورەیان نواند.

**لەم ئایەتەدا چەندین بەڵگە هەیە لە سەر ڕاستی جادو :**

یەک: فێڵ کردن لە چاوی هەزاران و ملیونان کەس ناکرێ گاڵتە بێ چونک ژیری لە ڕێی هەستەکانە شتەکان بینا دەکاو بڕیاری لەسەر دەدا.

دوو: خوا دەفەرموێ: (واسترهبوهم) واتە خەڵکیان ترساند، خەڵکیان تۆقاند، ئەدی دەکرێ خەڵک لە شتێک بتۆقێ کە هیچ نەبێ و کاریگەری نەبێ.

**سێ: خوا دەفەرموێ: (وجاءوا بسحرعظيم) واتە هاتن بە جادویەکی گەورە، ئایا دەکرێ خوای گەورە شتێک وەسف کا بە گەورە لەولاوە تۆ بڵێی بچوکەو کاری گەری نییە.**

**ب. یەکێک لە پێغەمبەرە گەورەکان کە موسایە کاری زۆر گرنگی ئەوە بوە کە جادوی جادو گەران بەتاڵ کاتەوە، ئایا دەکرێ ئەوە کاریگەری نەبێ**

**ت. هەر ئایەتی دووەمیش کە کۆمەڵەی یەکەم بە بەڵگەیان هێناوەتەوە بەڵگەیە لەسەریان نەوەک بۆ ئەوان ئەگەر لێی وردبنەوە چۆن؟** قَالَ بَلْ أَلْقُواْ فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَىٰ **(طه: ٦٦)**

**دەکرێ بەشێک لە جادو خەیاڵبێ نەوەک هەموو بەشەکانی**

**وە خوای گەورە دەربارەی ئەم جادوەی ساحیرەکان دەفەرموێ:** فَأَوْجَسَ فِي نَفْسِهِۦ خِيفَةً مُّوسَىٰ **(طه: ٦٧)**

**وا هاتە پێش چاوی (مووسا) بەهۆی جادووەکەیانەوە کە بەڕاستی دەجوڵێن و دەڕۆن جا مووسا لە دڵی خۆیدا کەمێ ترسا.**

**ئایا موسا دەکرێ لە شتێک بترسێ کە حەقیقەتی نەبێ؟ ئەگەر بشڵێن لەوانەیە ترس لە خەڵک بوبێ کە کاریگەربن، بەڵێ دەکرێ ئەم واتایەی هەبێ بەڵام ئەوە پێچەوانەی ڕواڵەتی ئایەتەکەیە، وە دەکرێ موسا هەردوو ترسەکەی هەبوبێ چ ڕێگریەک هەیە ئەگەر وابێ، وە موسا مرۆڤ بوە مرۆڤیش ترسی هەیە ئەی بۆ ی کاتێک خوای گەورە پێی فەرموو دار عەساکەت فڕێدە، ئەویش فرێی داو بوو بەمار ترسا؟ ئەویش هەر لە جۆرەیە.**

**ث. خوای گەورە باسی کاریگەری جادوی کردوە بە سەر ژیری خەڵکەوە، وە هەروەها بۆ لێکجیاکردنەوەی ژن و مێرد، باشە ئەگەر ئەمە کاریگەرینەنێ چۆن**

**خوای گەورە باسی دەکا، وەک دەفەرموێ:** وَٱتَّبَعُواْ مَا تَتْلُواْ ٱلشَّيَٰطِينُ عَلَىٰ مُلْكِ سُلَيْمَٰنَ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَٰنُ وَلَٰكِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ كَفَرُواْ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحْرَ وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَٰرُوتَ وَمَٰرُوتَ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦ وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَلَقَدْ عَلِمُواْ لَمَنِ ٱشْتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنْ خَلَٰقٍ وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْاْ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ (البقرة: ١٠٢) **جوولەکەکان دوای ئەو(شتانە) کەوتن کەشەیتانەکان دەیان خوێندەوە (بۆ خەڵکی) لەسەردەمی پاشایەتی سولەیمان دا، وە سولەیمان بێ بڕوا نەبوو بەڵام شەیتانەکان بێ بڕوا بوون خەڵکیان فێری جادوو دەکرد هەروەها ئەوەی نێردراوەتە خوارەوە لە بابل بۆ سەر هارووت و مارووت(دوو فریشتە بوون) وە(ئەمانە) کەسیان فێر نەدەکرد تا پێیان نەوتایە ئێمە هەرتاقی کەرەوەی (ئادەمیزاد) ین کەواتە بێ بڕوامەبە ئینجا فێری جادووی وا دەبوون لێیانەوە کە ژن و مێردی پێ لەیەک بکەن ئەوان بەم جادووە ناتوانن زیان بەکەس بگەیەنن مەگەر بەویستی خوا وە فێری شتێک دەبن کە زیانیان پێ دەگەیەنێ نەک قازانج بێگومان زانیان هەرکەسێ جادوو بکڕێ(بەفەرموودەی تەورات) لەڕۆژی دواییدا بێ بەش دەبێ بەڕاستی زۆر بەدە ئەو شتەی کە(بڕوای) خۆیانیان پێ فرۆشت ئەگەر بیانزانیایە.**

**ئەم ئایەتە زۆر ڕوونە کە ئەم دوو فریشتە یان ئەم دوو پیاوە باشە هاتون بە ئەمری خوا خەڵک لەم مەترسیە گەورە ئاگادار بکەنەوە، ئەویش ئەوەیە کە بەخەڵک بڵێن بە هۆی ئەوەی کە ئێمە فێرتان دەکەین جادو و موعجیزە لەیەک جیابکەنەوە.**

**وە پێیان وتون بە هۆی جادو خۆتان کافر مەکەن، بەڵام ئەوان دەهاتن بە هۆی جادوو ژن و مێردیان لێک جیادەکردەوە، ئایا لێکجیاکردنەوەی ژن و مێرد**

حەقیقەت نیەو پێی ناوترێ کاریگەری، بەڵێ هیچ شتێک بە بێ ویستی کەونی و قەدەری خوا نابێ بەڵام ئەگەر خوا ویستی لەسەر بێ دەبێ، هەر وەک چۆن کەسێک ژەهرێکی کوشندە بخوا دەمرێ بە ویستی خوا جادوش هەروایە، مەرج نیە ئەوەی لە ویستی کەونی خوابێ لە ویستی شەرعی خوا بێ، خوای گەورە بە کوفرو شیرک و تاوان ڕازی نییە بەڵام بە ویستی کەونی خوا هەن نەوەک بەویستی شەرعی چونکە لە شەرعدا نەهی لێکردون:

﴿إِن تَكۡفُرُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنكُمۡ وَلَا يَرۡضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلۡكُفۡرَ وَإِن تَشۡكُرُواْ يَرۡضَهُ لَكُمۡ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٞ وِزۡرَ أُخۡرَىٰ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرۡجِعُكُمۡ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ (الزمر: ٧) ئەگەر ئێوە بێ باوەڕبن ئەوە بێگومان خوا بێ نیازە لە ئێوە و ڕازی نی یە بە بێ باوەڕی بۆ بەندەکانی وە ئەگەر سوپاسی خوا بکەن (گەردن کەچ بن) بەوە لێتان ڕازی دەبێت هیچ گوناهبارێ گوناهی کەسێکی تر هەڵناگرێت پاشان گەڕانەوەتان هەر بۆ لای پەروەردگارتانە ئەوسا هەواڵتان دەداتێ بەوەی کە دەتان کرد بەڕاستی خوا ئاگادارە بە نهێنی دڵان.

**ج.** وە لە هەموو دینە ئاسمانیەکان باسی جادوکراوە.

**ح.** وەخەڵکی لە هەموو دونیا بڕوای پێ یەتی.

**خ.** وە کاریگەریەکانی بە روونی دیارن.

**د.** وە پێغەمبەری خوا جادوی لێکراوە.

**ذ.** وە زانست نەشی سەلمێنێ ناتوانێ ئینکاری بکا، چونکە زانست بۆ هەیە باسی ئەوە بکە کە دەیزانێ نەوەک نایزانێ.

١٠. وە جادو یەکێکە لە تاوانە گەورەو بەهیلاکدەرەکان: جا چۆن دەکرێ شتێک هیچ نەبێ و کاریگەری نەبێ مرۆڤ بە هیلاک بەرێ و یەکێک بێ لە قورسترین

تاوانەکان: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ : " اجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقَاتِ ". قَالُوا : يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَا هُنَّ ؟ قَالَ : " الشِّرْكُ بِاللَّهِ، وَالسِّحْرُ، وَقَتْلُ النَّفْسِ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ، وَأَكْلُ الرِّبَا، وَأَكْلُ مَالِ الْيَتِيمِ، وَالتَّوَلِّي يَوْمَ الزَّحْفِ، وَقَذْفُ الْمُحْصَنَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ الْغَافِلَاتِ ، رواه البخاري ٢٧٦٦،

**لە دوای تاوانی شیرک باسی جادو کراوە:**

- ✓ **جا کێ دەڵێ زانست هەمووی کیمیاو فیزیاو ئەحیاو ماتماتیکە، مەگەر زانستە مرۆڤایەتیەکان هیچ کام لە مانەن؟ لە گەڵ ئەوەشدا سەدان هەزاران ناوەندو پەیمانگاو کۆلێژو دەزگاو تاقیگەی بۆ دانراوە.**
- ✓ **وە ئەگەر جادو کاریگەری نییە ئەی بۆ لە شەرعدا لای زۆربەی زانایان سزای بۆ دانراوە.**
- ✓ **بۆیە ئەوانەی نکولی لە بونی جادو و کاریگەریەکانیان دەکەن بەڵگەکانیان لە ڕووی دەق ژیری و واقعی زۆر لاوازە، من تەمەننام دەکرد کە کاریگەری نەبا بەڵام بڵێم چی کە وا نییە.**
- ✓ **بەشي هەرە گرنگی جادو لە ڕێی جنۆکەوە دەکرێ.**

**هیچ جێگای دوودڵی نییە کە بەشە هەرە خراپ و زۆری جادو لە ڕێی جنۆکەو ڕازیکردن و خزمەتکردنی ئەوانەوە دەکرێ هەم بە بەڵگەی نەقلی، هەم بە بەڵگەی واقعی.**

**لە ڕووی دەق:**

**پەیوەندی تۆکمە هەیە لە نێوان جنۆکەو کەسە خراپ و جادوکەرەکانەوە، خوای گەورە دەفەرموێ:** وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا شَيَٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ يُوحِى بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ (الأنعام:

﴿١١٢﴾) هەر بەو شێوەیە (کێشمە کێشی ئیمانداران و خوانەناسان بەردەوامە) جا بۆ هەموو پێغەمبەرێک (بۆ ئیماندارانیش) دوژمنێکمان لە شەیتانەکانی ئادەمیزاد و پەری سازاندوە، کە بەردەوام قسەی زل و ڕازاوە دەدەن بەگوێی یەکداو (خۆیان و خەڵکی) پێ سەرگەردان و گومڕا دەکەن، خۆ ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە (نەیاندەتوانی) شتی وابکەن، دە وازیان لێ بهێنە لەگەڵ ئەو درۆو دەلەسەیەی کە هەڵی دەبەستن (بۆ کوێ دەچن، لە دەست سزای خوایی ڕزگار نابن).

**ئەم ئایەتە پیرۆزە زۆر بە ڕوونی باسی پەیوەندەی شەیتانەکان و مرۆڤە خراپەکان دەکەن بەوەی:**

- کە وەحی بۆ یەک دەکەن
- یەکتر فریو دەدەن
- شت بۆ یەک دەرازێننەو و
- دژایەتی پێغەمبەران و پیاو چاکان دەکەن بە هاوکاری یەکتر
- خوای گەورەش هەرەشەیان لێدەکا، نافەرموێ هیچ کاریگەری و دەوریان نییە.

**خوای گەورە دەفەرموێ:** وَلَا تَأْكُلُوا۟ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُۥ لَفِسْقٌ وَإِنَّ ٱلشَّيَـٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِهِمْ لِيُجَـٰدِلُوكُمْ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ (الأنعام: ﴿١٢١﴾) لەو (سەر بڕاوە) مەخۆن کەناوی خوای لەسەر نەهێنرایەوە (کاتی سەربڕین) بێگومان (خواردنی) ئەوە تاوان و لەسنوور دەرچوونە وە بێگومان شەیتانەکان بەنهێنی شت بەدۆستانیان دەڵێن بۆ ئەوەی موجادەلەو دەمە دەمێتان لەگەڵ بکەن جا ئەگەر بەگوێیان بکەن ئەوە بێگومان لەهاوبەش بڕیار دەران دەبن.

**ئەم دەقە پێمان دەڵێ:**

- ✓ که شەیتانەکان دۆستی ئادەمیان هەن.
- ✓ پەیوەندیان بە یەکەوە هەیە.
- ✓ هانیان دەدەن لە گەڵ ئێوەدا دەمە تەقێ بکەن.
- ✓ ئەگەر بە قسەیان بکەن دەبن بە هاوبەش پەرست.

وە هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا يَٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ قَدِ ٱسْتَكْثَرْتُم مِّنَ ٱلْإِنسِ وَقَالَ أَوْلِيَآؤُهُم مِّنَ ٱلْإِنسِ رَبَّنَا ٱسْتَمْتَعَ بَعْضُنَا بِبَعْضٍ وَبَلَغْنَآ أَجَلَنَا ٱلَّذِىٓ أَجَّلْتَ لَنَا قَالَ ٱلنَّارُ مَثْوَىٰكُمْ خَٰلِدِينَ فِيهَآ إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ (الأنعام: ١٢٨) وە ڕۆژێك (خوا) تێکڕا کۆیان دەکاتەوە (دەفەرموێ) ئەی دەستە و کۆمەڵی جنۆکە بێگومان ئێوە زۆر کەستان لە ئادەمیەکان گومڕا کرد وە دۆستەکانیان لە ئادەمی دەڵێن ئەی پەروەردگارمان هەندێکمان سوود و کەڵکمان لە هەندێکیان وەرگرت، وە بەو کاتە و مۆڵەتە گەیشتین کە بۆت دیاری کردبووین، خوا فەرمووی ئاگر شوێنتانە بە هەمیشەیی و بێ بڕانەوە دەمێننەوە تیایدا جگە لەو کاتەی کە خوا بیەوێ بەڕاستی پەروەردگارت کار دروستی زانایە.

**ئەم دەقە بە ڕوونی پێمان دەڵێ :**

- ❖ کە جنۆکەکان ئادەمیان فریوداوە.
- ❖ ئادەمیەکان حاشا لەو فریودانە ناکەن.
- ❖ توشی ئاگریان کردون.
- ❖ لەزەتیان لە یەکتر وەرگرتوە.
- ❖ ئایا ئەمە ڕوون نییە لە پەیوەندی مرۆڤی خراپ و شەیتانەکان، جا کێ لە جادوکەرەکان خراپترە، هەندێک زانیاری لای جادوکەرەکانە کە ئەمە ناکرێ

لە رێی جنۆکەوە وەرنەگیرابێ، وە زانست پەی بەم جۆرە زانیاریانە نابا، مەبەستمان زانیاری ڕووت(العلم البحت) دەنا زانیاری ناتوانێ نکوڵی لە ڕاستیەکان بکا..

❖ یەکیتر لە بەڵگەکان دانپێدا هێنانی ئەو هەموس جادوو گەرەیە کە تەوبەیان کردوە، ئەوانە بە ئاشکرای دەڵێن ئێمە سودمان لە جنۆکە وەرگرتوە بۆ هەواڵ، بۆ دۆزینەوەی شت، بۆ خراپەکردن و تێکدان و نەخۆشکردن و جنۆکە خستنە ناو لاشە.

**التنويم المغناطيسی:**

نواندنی موغناتیسی قسەی زۆری لەسەرە کە چیەو پەیوەندی بە چیەوە هەیە؟ وە ئایا دروستە سودی لێوەربگیرێ یان نا؟ وە ئایا پەیوەندی بە روحەوە هەیە، یان بە قەرینەوە هەیە؟ ئایا زانستی پزیشکی و دەرونزانی وەڵامی تەواوی بۆ ئەم بوارە پێ یە؟

گومان لەوەدا نییە کە ئەم نواندنە هەیە، بەڵام دیار نیە بە هۆی چییەوەیە نە لە ڕووی زانستیەوە، نە لە ڕووی تەجروبییەوە، بۆیە هەتا ئێستاش جەوهەرو روحی نواندنی موغناتیسی نادیارە، وە لە لایەنی پزیشکی بۆ چارە سەری هەندێ نەخۆشی بە کار دەهێنرێ، وە دروستیشە مادام پەنا بۆ شتی قەدەغەکراو نەبردرێ.

بەڵام هەندێک شت و زانیاری هەیە کە لە ڕێی ئەم نواندنەوە دەکرێ، یان دەبێ بڵێین ئەمە ئامادەکردنی روحە و تحکم بە ڕووحە کە دەکا، ئەمەیان دورە، چونکە ڕووح تەواو غەیبیەو زۆر کەمی دەربارەوەو دەزانرێ، یان دەبێ بڵێین پەیوەندی بە قەرینەوە هەیە کە کەسەکە کە ناوی خەوێنەرەکەیە، یان جادوگەرەکە بەکاری دێنێ.

هەتا خەوێنەرەکە بە هێزتر بێ دەتوانێ زیاتر قەرینەکە بەکار بێنێ، وە ئەوەش کە بەکار دەهێنرێ جۆری زۆرن ئە گەر لە عفریت و ماردەکان و غەواسەکان بن تواناییان زیاترەو زانیاریان زیاترە، بۆیە ئەگەری زۆری هەیە بەشی هەرە زۆری لایەنی تەنویمی موغناتیسی پەیوەندی بە جنۆکەوە هەبێ، ئەوەی کە لە زارەوەی دینی پێی دەوترێ (کاهن، عراف، جادوگەر، فاڵچی) بەڵام بۆ ئەوەی زانست زۆر سڵی لێنەکاتەوە ناویان لێناوە نواندنی موغناتیسی، کەواتە ئەو خەوواندنە بەڵگەیەکی زۆر بە هێزە بۆ تحکم بە مرۆڤ لە ڕێی جنۆکە کە خوێنەر یان فاڵچی یان جادوگەر دەیکا، ئەم ئەگەرەیان لە هەموو ئەگەرەکانی تر بە هێزترە.

یەکیتر لە بەڵگەکانی کاریگەری جنۆکەو شەیتانەکان لەسەر مرۆڤ، فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەیەتی بە خۆ پەنادان لە شەیتان و جنۆکە.

خوای گەورە فێرماندەکاو ڕێنماییمان دەکا بەوەی پەنا بگرین بە خوا لە شەیتان و جنۆکە، وە هەروەها لە دەیان فەرمودەشدا ئەوە هاتوە،

**بۆ نمونە هەندێک بەڵگە لە قوڕئان و سونە باس دەکەین لە سەر ئەو خۆ پەنادانە:**

١. کاتی قوڕئان خوێندن کە یەکێکە لە گەورەترینی بەندایەتیەکان: فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ (النحل: ٩٨) ئەی (موحەممەد (صلی الله علیه وسلم)) کاتێ ویستت قورئان بخوێنی پەنا بگرە بە خوا لە شەیتانی دەرکراو لەبەزەیی خوا.

٢. لە کاتی خوێندنی نوێژ پێش بسم الله کردن و خوێندنی فاتیحە.

٣. کاتێک مرۆڤ هەست دەکا بەوەی شەیتان دەیەوێ تاوانی پێبکاو هانیدەدا: وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ (فصلت: ٣٦)

**وە ئەگەر لە شەیتانەوە تووشی خەتەرەو خەیاڵی نادروستی بوویت ئەوە پەنا بگرە بەخوا چونکە بەڕاستی هەر ئەو بیسەری زانایە.**

**٤. لە کاتێکدا خەریکە کارێکی نەفامانە ئەنجامدەی:** وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تَذْبَحُوا۟ بَقَرَةً قَالُوٓا۟ أَتَتَّخِذُنَا هُزُوًا قَالَ أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ (البقرة: ٦٧) **وە بیربکەنەوە کاتیک کە مووسا بەگەلەکەی وت بێگومان خوا فەرمانتان پێ دەدات کە مانگایەک سەرببڕن وتیان: ئایا گاڵتەمان پێ دەکەیت؟ وتی: پەنا ئەگرم بەخوا کەلە نەفامان بم.**

**٥. لە کاتێکدا بێباوەڕان خۆ بەزلگری دەنوێنن و دەیانەوێ زیانت پێ بگەیەنن:** وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِنِّى عُذْتُ بِرَبِّى وَرَبِّكُم مِّن كُلِّ مُتَكَبِّرٍ لَّا يُؤْمِنُ بِيَوْمِ ٱلْحِسَابِ (غافر: ٢٧) **وە مووسا وتی: بەڕاستی من پەنا دەگرم بە پەروەردگاری خۆم و پەروەردگاری ئێوەش لە هەموو خۆ بەزل زانێك كە باوەڕی بەڕۆژی لێ پرسینەوە نی یە.**

**٦. یوسف سەلامی خوای لێبێ کاتێک ئافرەتەکەی خێزانی عەزیزی میسر ویستی توشی خەراپەی بکا:** وَرَٰوَدَتْهُ ٱلَّتِى هُوَ فِى بَيْتِهَا عَن نَّفْسِهِۦ وَغَلَّقَتِ ٱلْأَبْوَٰبَ وَقَالَتْ هَيْتَ لَكَ قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِ إِنَّهُۥ رَبِّىٓ أَحْسَنَ مَثْوَاىَ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ (یوسف: ٢٣) **ئەو ئافرەتەی یوسف لەماڵیدا بوو دەست تێکەڵاوی لەیوسف ویست و هەموو دەرگاکانی داخست وتی وەرە پێشەوە بەپەلە بۆ ئەوەی بۆت ئامادەیە (یوسف) وتی من پەنا دەگرم بەخوا بەڕاستی ئەو (خوا) پەوەردگاری منە (یا عەزیزی میسر خاوەنی منە) ڕێزی لێ گرتووم بەڕاستی ستەم کاران ڕزگار نابن.**

**٧. خوای گەورە فەرمانمان پێدەکا لە بەر زیانی هەر دروستکراوێک پەنا بۆ خوا بەرین:** قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ (الفلق: ١)**ئەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم) بڵێ: پەنا دەگرم بە دروست کەری بوونەوەر واتە بەرەبەیان.**

مِن شَرِّ مَا خَلَقَ (الفلق: ٢) **لە زیانی ئەوەی کە دروستی کردووە.** وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ (الفلق: ٣) **وە لە زیانی تاریکی کاتێک کە دابێ.** وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّٰثَٰتِ فِي ٱلْعُقَدِ (الفلق: ٤) **وە لە زیانی فووکەران(جادوو کەران) بە گرێ یاندا.** وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ (الفلق: ٥) **وە لە زیانی بەخیل و حەسوود کاتێک کە حەسوودی ببات.**

**لەم سورەتە پیرۆزەدا خوای گەورە فێرمان دەکا کە بەردەوام پەنا بۆ خوا بەرین لە زیانی دروستکراوەکان جا هەر شتێک بن لەوانە:**

- **شەوەزەنگ**
- **جادوگەرەکان**
- **ئێرەی و حەسود بەرەکان**

**لە سورەتی الناس خوای گەورە دووبارە ڕێنماییمان دەکا بۆ ئەو پەناگرتنە وەک دەفەرموێ:** قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ (الناس: ١) ئەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم) بڵێ: پەنا دەگرم بە پەروەردگاری خەڵکی. مَلِكِ ٱلنَّاسِ (الناس: ٢) **پادشای خەڵکی.** إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ (الناس: ٣) پەرستراوی خەڵکی. مِن شَرِّ ٱلْوَسْوَاسِ ٱلْخَنَّاسِ (الناس: ٤) لە زیانی وەسوەسە پەیداکەری خۆ پەنهان کەر. ٱلَّذِى يُوَسْوِسُ فِى صُدُورِ ٱلنَّاسِ (الناس: ٥) ئەوەی کە وەسوەسە ئەخاتە دڵی خەڵکی. مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ (الناس: ٦) لە جنۆکە و لە ئادەمیزاد.

**خوای گەورە فەرمانمان پێدەکا سێ جار پەنا بەخوا بگرین لە زیانی وەسوەسە پەیداکەری خۆپەنهانکەر**

**بەلام لە سورەتی فلق یەک جار پەنامان بە خوا گرت لە زیانی هەموو دروستکراوەکان، ئە مەش بەڵگەیە لە سەر مەترسی شەیتان و جنۆکە، وە شوێن و**

سەرچاوەی ئەو وەسوەسەیە دڵی مرۆڤە، وە دوو کەس بەوە هەڵدەستن جنۆکەو ئادەمی.

٨. لە کاتێک شەیتان دەیەوێ بتخاتە گومان لە بیرو باوەڕت: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " يَأْتِي الشَّيْطَانُ أَحَدَكُمْ فَيَقُولُ : مَنْ خَلَقَ كَذَا ؟ مَنْ خَلَقَ كَذَا ؟ حَتَّى يَقُولَ : مَنْ خَلَقَ رَبَّكَ ؟ فَإِذَا بَلَغَهُ فَلْيَسْتَعِذْ بِاللَّهِ وَلْيَنْتَهِ رواه البخاری،٣٢٧٦

٩. کاتێک شەیتان ویستی نوێژت لێ تێکبدا: أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ أَبِي الْعَاصِ أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ : يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ الشَّيْطَانَ قَدْ حَالَ بَيْنِي وَبَيْنَ صَلَاتِي وَقِرَاءَتِي، يَلْبِسُهَا عَلَيَّ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " ذَاكَ شَيْطَانٌ يُقَالُ لَهُ : خِنْزَبٌ، فَإِذَا أَحْسَسْتَهُ فَتَعَوَّذْ بِاللَّهِ مِنْهُ، وَاتْفِلْ عَلَى يَسَارِكَ ثَلَاثًا ". قَالَ : فَفَعَلْتُ ذَلِكَ، فَأَذْهَبَهُ اللَّهُ عَنِّي. رواه مسلم،٢٢٠٣

١٠. لە کاتی توڕەبوندا پەنا بۆ خوا بەرین: اسْتَبَّ رَجُلَانِ عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَغَضِبَ أَحَدُهُمَا، فَاشْتَدَّ غَضَبُهُ حَتَّى انْتَفَخَ وَجْهُهُ وَتَغَيَّرَ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " إِنِّي لَأَعْلَمُ كَلِمَةً لَوْ قَالَهَا، لَذَهَبَ عَنْهُ الَّذِي يَجِدُ ". فَانْطَلَقَ إِلَيْهِ الرَّجُلُ، فَأَخْبَرَهُ بِقَوْلِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَقَالَ : تَعَوَّذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ. فَقَالَ : أَتُرَى بِي بَأْسٌ، أَمَجْنُونٌ أَنَا ؟ اذْهَبْ.رواه البخاری،٦٠٤٨

١١. لە کاتی بینینی خەوی ناخۆش: أَبَا قَتَادَةَ يَقُولُ : سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ : " الرُّؤْيَا مِنَ اللَّهِ، وَالْحُلْمُ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَإِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ شَيْئًا يَكْرَهُهُ، فَلْيَنْفِثْ حِينَ يَسْتَيْقِظُ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، وَيَتَعَوَّذْ مِنْ شَرِّهَا ؛ فَإِنَّهَا لَا تَضُرُّهُ ". وَقَالَ أَبُو سَلَمَةَ : وَإِنْ كُنْتُ لَأَرَى الرُّؤْيَا أَثْقَلَ عَلَيَّ مِنَ الْجَبَلِ، فَمَا هُوَ إِلَّا أَنْ سَمِعْتُ هَذَا الْحَدِيثَ فَمَا أُبَالِيهَا.رواه البخاری،٥٧٤٧

١٢. لە کاتی چونە مزگەوت: نْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، أَنَّهُ كَانَ إِذَا دَخَلَ الْمَسْجِدَ قَالَ : " أَعُوذُ بِاللَّهِ الْعَظِيمِ وَبِوَجْهِهِ الْكَرِيمِ وَسُلْطَانِهِ الْقَدِيمِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ". قَالَ : أَقَطْ ؟ قُلْتُ : نَعَمْ. قَالَ : " فَإِذَا قَالَ ذَلِكَ قَالَ الشَّيْطَانُ : حُفِظَ مِنِّي سَائِرَ الْيَوْمِ رواه ابوداود،٤٦٦".حكم الحديث: صحيح

١٣. کاتێک گوێمان لە وەڕینی سەگ و زەڕەی گوێدرێژبو: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " إِذَا سَمِعْتُمْ نُبَاحَ الْكِلَابِ وَنَهِيقَ الْحُمُرِ بِاللَّيْلِ فَتَعَوَّذُوا بِاللَّهِ ؛ فَإِنَّهُنَّ يَرَيْنَ مَا لَا تَرَوْنَ ".رواه ابوداود، ٥١٠٣، حكم الحديث: صحيح

١٤. گەر کەسێک ویستی لە جێگایەک بمێنێتەوەو بارگە بخا: مَنْ نَزَلَ مَنْزِلًا، ثُمَّ قَالَ : أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ. لَمْ يَضُرَّهُ شَيْءٌ حَتَّى يَرْتَحِلَ مِنْ مَنْزِلِهِ ذَلِكَ ،رواه مسلم،٢٧٠٨

١٥. کاتی چونە سەرئاو: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا دَخَلَ الْخَلَاءَ قَالَ : " اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخُبُثِ وَالْخَبَائِثِ "رواه البخارى،١٤٢

١٦. لە کاتێک شوێنێکت ئازاری دەبێ دەستت بخە سەری و حەوی جار ئەم زیکرە بخوێنە: عَنْ عُثْمَانَ بْنِ أَبِي الْعَاصِ الثَّقَفِيِّ ، أَنَّهُ شَكَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَجَعًا يَجِدُهُ فِي جَسَدِهِ مُنْذُ أَسْلَمَ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " ضَعْ يَدَكَ عَلَى الَّذِي تَأَلَّمَ مِنْ جَسَدِكَ، وَقُلْ : بِاسْمِ اللَّهِ. ثَلَاثًا، وَقُلْ سَبْعَ مَرَّاتٍ : أَعُوذُ بِاللَّهِ وَقُدْرَتِهِ مِنْ شَرِّ مَا أَجِدُ وَأُحَاذِرُ ، رواه مسلم،٢٢٠٢

١٧. بەیانی و ئێواران ئەو نزایە بخوێنین : عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ : يَا رَسُولَ اللَّهِ، مُرْنِي بِكَلِمَاتٍ أَقُولُهُنَّ إِذَا أَصْبَحْتُ وَإِذَا أَمْسَيْتُ. قَالَ : " قُلِ : اللَّهُمَّ فَاطِرَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ، عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ، رَبَّ كُلِّ شَيْءٍ وَمَلِيكَهُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ نَفْسِي وَشَرِّ الشَّيْطَانِ وَشِرْكِهِ ". قَالَ : " قُلْهَا إِذَا أَصْبَحْتَ وَإِذَا أَمْسَيْتَ وَإِذَا أَخَذْتَ مَضْجَعَكَ ".رواه ابوداود،٥٠٦٧،حكم الحديث: صحيح

١٨. لە کاتی لە خەو ڕابون و ترسان: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُعَلِّمُهُمْ مِنَ الْفَزَعِ كَلِمَاتٍ : " أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّةِ، مِنْ غَضَبِهِ وَشَرِّ عِبَادِهِ، وَمِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ وَأَنْ يَحْضُرُونِ ". وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ يُعَلِّمُهُنَّ مَنْ عَقَلَ مِنْ بَنِيهِ، وَمَنْ لَمْ يَعْقِلْ كَتَبَهُ فَأَعْلَقَهُ عَلَيْهِ.رواه أبوداود،٣٨٩٣

١٩. سونە تە منداڵەکان پەنا بگری بە خوا لە شەیتان و چاوپیسی: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُعَوِّذُ الْحَسَنَ وَالْحُسَيْنَ : " أُعِيذُكُمَا بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّةِ، مِنْ

كُلِّ شَيْطَانٍ وَهَامَّةٍ ، وَمِنْ كُلِّ عَيْنٍ لَامَّةٍ ". ثُمَّ يَقُولُ : " كَانَ أَبُوكُمْ يُعَوِّذُ بِهِمَا إِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ ."

٢٠. قَالَ أَبُو دَاوُدَ : هَذَا دَلِيلٌ عَلَى أَنَّ الْقُرْآنَ لَيْسَ بِمَخْلُوقٍ ،رواه أبوداود، ٤٧٣٧حكم الحديث: صحيح

**وە زۆر حاڵەتی گرنگ هەیە کە دەبێ مرۆڤ خۆی پەنا بدا بە خوا لە شەیتان و جنۆکە هەموو ئەوانە بەڵگەن لە سەر کاریگەری ئەوان لەسەر مرۆڤ بە خراپە.**

**بەڵام پرسیارو (بيت القصيد) ئەوەیە ئەم پەنادان و پەناگرتنانە چ پەیوەندیان هەیە بەوەی جنۆکە دەچێتە لاشەی مرۆڤەوە؟**

**بەڵێ پەیوەندی هەیە چونکە ئێمە کۆمەڵێک بەڵگەمان بۆ هێنایەوە ئەم ئایەت و فەرمودانەش هەمان بابەت بە هێزتر دەکەن بە ناڕاستەو خۆی بە جۆرێکی تر، چونکە ئەگەر جنۆکە کاریگەری نەبێ چ پێویست دەکات ئەو هەموو ترس و وریایی دانەی لێ بکرێ.**

**تەوەری هەشتەم**

## ئایا جنۆکە تەکلیف کراون بە شوێن کەوتنی پێغەمبەر؟ وە ئایا پێغەمبەر ئەوانی بینیوە؟

**ئەم بابەتە جێگای مشتومڕە لە نێوان زانایانی ئیسلامدا ئێمە لە چەند خاڵێکدا ئەم بابەتە ڕووندەکەینەوە بە پشتیوانی خوای گەورە:**

**١. ئایا جنۆکەکان شەریعەتی تایبەت بە خۆیان هەیە یان شوێنکەوتەی شەریعەتەکانی خوان کە بۆ مرۆڤ هاتون؟**

**دەبێ جیاوازی بکەین لە زەمانی دوای دروستبونی مرۆڤ و سەردەمی پێش دروسبونی مرۆڤ، گومان لەوەدا نیە کە پێش دروستبونی مرۆڤ ناگونجێ بەو شەریعەتە کە بۆ مرۆڤ هاتوە، چۆن فریشتەکان مکلف بون ئەوانیش مکلف بون بەڵام چۆن بە چی؟ ئەوە ئێمە لێی نازانین، بەڵام مادام جنۆکەش بە دەقی ئایەت بۆ بەندایەتی دروستبوە دەبێ ئەوانیش مکلف بووبن :**

وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ (الذاريات: ﴿٥٦﴾) **وە من جنۆکە و ئادەمیزادم تەنها بۆ ئەوە دروست کردووە کە بەندایەتی من بکەن.**

**وە ئەگەر جنۆکە مکلف نەبا فەرمانی پێنەدەکرا کڕنۆش بۆ ئادەم بەرێ کە ئەو فەرمانە تەکلیفە.**

**٢. لە دوای ئەوەی کە مرۆڤ هاتوە ئایا بەچی دینێک مکلف بون؟ ئایا شەریعەتی سەربەخۆیان هەبوە، یان تابعی مرۆڤبون؟ واتە ئەوانیش مکلف بون بە شەریعەتی ئینسانەوە؟ لە ڕاستیدا ئەگەر بە پێی بەڵگەکانی قورئان و سونەت بێ زیاتر پشتیوانی لە وە دەکرێ کە تابعی مرۆڤبن،**

**بەڵام بەڵگەش هەیە کە شەریعەتی سەر بەخۆیان بوبێ، بەڵگە بۆ ئەوە چییە؟:**

- **دەکرێ هەر بەم شەریعەتە مکلف بن کە پێش مرۆڤ پێی مکلف بوبن.**
- **دەکرێ وەک مرۆڤ شەریعەتەکانیان پەیتا پەیتا گۆڕابێ.**
- **بەڵگە هەیە کە ئەوان ئاگاداری شەریعەتەکانی تریش بوون وەک خوای گەورە دەفەرموێ:** قَالُواْ يَٰقَوْمَنَآ إِنَّا سَمِعْنَا كِتَٰبًا أُنزِلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِيٓ إِلَى ٱلْحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ (الأحقاف: ٣٠) **وتیان ئەی هۆزو قەومەکەمان بەڕاستی ئێمە گوێ بیستی کتێبێك بووین کە لەپاش مووسا نێردراوەتە خوارەوە پەڕاوەکانی پێش خۆی بەڕاست دادەنێ (خەڵك) ڕێنموونی دەکات بۆ هەق بۆ ڕێبازی ڕاست.**
- **وە دەکرێ بە پێی چەند بەڵگەیەک ئەوانیش نێردراوی تایبەتی خۆیان هەبێ، جا چ پێغەمبەربێ یان وریاکەرەوە بووبێ، بەڵگە بۆ ئەوە ئەوان مکلف ن، بە شەریعەت:** يَٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَقُصُّونَ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِي وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا قَالُواْ شَهِدْنَا عَلَىٰٓ أَنفُسِنَا وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَنَّهُمْ كَانُواْ كَٰفِرِينَ (الأنعام: ١٣٠) **ئەی دەستە و کۆمەڵی جنۆکە و ئادەمی ئایا پێغەمبەرانتان لە خۆتان بۆ نەهات کە ئایەتەکانی منتان بۆ بخوێننەوە وە لە گەیشتن و دووچار بوونی ئەم ڕۆژەیان نەترساندن دەڵێن(ڕاستەو) گەواهی لەسەر خۆمان دەدەین بەڵام ژیانی دنیا خەڵەتاندنی و گەواهیان لەسەر خۆیان دا کە بێگومان ئەوان بێ بڕوا بوون، .لێرەدا جنۆکەو ئادەمی دوێندراون، وە دان دەنێن بە هەبونی ڕەوسول و ڕیسالەت.**
- **وە خوای گەورە دەفەرموێ هەموو قەومێک ڕێنمایی کاری هەبوە ئەوانیش قەوم:** وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦٓ إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرٌ وَلِكُلِّ قَوْمٍ هَادٍ (الرعد: ٧) **وە ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون دەیان وت ئەوە بۆ**

نەنێردراوەتە خوارەوە بۆی موعجیزەیەك لەلایەن پەروەردگاریەوە ئەی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم) تۆ هەر ترسێنەری و بۆ هەموو گەلێك ڕێ نیشاندەرێك هەیە.

❖ ئەوانیش ئومەتن هەموو ئومەتێکیش هادی و وریا کەرەوەیان بوە: إِنَّآ أَرْسَلْنَـٰكَ بِٱلْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ (فاطر: ﴿٢٤﴾) بێگومان ئێمە تۆمان بە (ئاینی) ڕاست ناردووە مژدە دەرو ترسێنەر بیت هەر گەل و ئوممەتێك (پێغەمبەرێکی) ترسێنەری تێدا هاتووە.

❖ وە ئەوان لە بەر ئەوەی لە ئێمە جیاوازن دەکرێ شێوازی ئەداکردنیان و ئەنجامدانیان بۆ بەندایەتی جیاواز بێ، واتە بە پێی بەڵگەکان دەکرێ ئەوان نێردراو و وریاکرەوەی تایبەتی خۆیان هەبێ.

**بەڵگەی ئەوانەی ئەوان تابعی مرۆڤن و مکلف ن بە شەریعەتی مرۆڤایەتی:**

١. خوای گەورە مرۆڤ و جنۆکە بەیەکەوە دەدوێنێ، ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەرکیان یەک ئەرکەو شەریعەتیشیان هەریەکە: يَـٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَقُصُّونَ عَلَيْكُمْ ءَايَـٰتِى وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَـٰذَا قَالُواْ شَهِدْنَا عَلَىٰٓ أَنفُسِنَا وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَنَّهُمْ كَانُواْ كَـٰفِرِينَ (الأنعام: ﴿١٣٠﴾) ئەی دەستە و کۆمەڵی جنۆکە و ئادەمی ئایا پێغەمبەرانتان لە خۆتان بۆ نەهات کە ئایەتەکانی منتان بۆ بخوێننەوە وە لە گەیشتن و دووچار بوونی ئەم ڕۆژەیان نەترساندن دەڵێن(ڕاستەو) گەواهی لەسەر خۆمان دەدەین بەڵام ژیانی دنیا خەڵەتاندنی و گەواهیان لەسەر خۆیان دا کە بێگومان ئەوان بێ بڕوا بوون.

**٢. خوای گەورە نزیکەی ٣٠ جار بە هەردوو گرۆهی جنۆکەو مرۆڤ دەفەرموێ:** فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ (الرحمن: ١٣) **جا ئیتر گرۆی ئادەمیزادو پەری بەکام لەنازو نیعمەتەکانی پەروەردگار بڕوا ناکەن، کامەی پەسەند ناکەن.**

**٣. خوای گەورە بەم قورئانە تەحەدای جنۆکەو مرۆڤی کردوە:** قُل لَّئِنِ ٱجْتَمَعَتِ ٱلْإِنسُ وَٱلْجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأْتُواْ بِمِثْلِ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِۦ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا (الإسراء: ٨٨) **ئەی (موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)) بڵێ سوێند بەخوا ئەگەر ئادەمی و پەری هەموو کۆببنەوە بۆ ئەوەی وێنەی ئەم قورئانە بێنن ناتوانن وێنەی ئەو بێنن هەرچەندە پشتیوانی یەکتریش بن.**

**٤. خوای گەورە لە سورەتی (الجن) بە وردی باسی بیرو باوەریان دەکا کە وا دەفەرموێ ئەوانیش وەک ئێمە بە قورئان و سەرسامن و مکلف ن:** قُلْ أُوحِىَ إِلَىَّ أَنَّهُ ٱسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ فَقَالُوٓاْ إِنَّا سَمِعْنَا قُرْءَانًا عَجَبًا (الجن: ١) **ئەی محمد صلى الله عليه وسلم پێیان بڵێ: وەحی و نیگام پێڕاگەیەنراوە کە بەڕاستی دەستەیەك لە پەریان گوێیان گرتووە بۆ خوێندنەوەی قورئان و جا کە تەواو بووە وتویانە: بەڕاستی ئێمە خوێندنەوەیەکی سەرسوڕهێنەرمان بیست.**

**٥. وە ئەوان ئیمانیان بە قورئان هێنا، ئەگەر ئەوان مکلف نین بۆچی ئیمان بە قورئان دێنن؟!.**

**٦. وە ئەوان لە دوای قورئان دەڵێن شەریک بۆ خوا بریار نادەین، دیارە لە بەر ئەوەیە قورئان نەهی لە شیرک کردوە، وەک دەڵێن:** يَهْدِىٓ إِلَى ٱلرُّشْدِ فَـَٔامَنَّا بِهِۦ وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَآ أَحَدًا (الجن: ٢) **ڕێنموونیی دەکات بۆ ڕێ ی ڕاست ئێمەش باوەڕمان پێ کرد وە هەرگیز کەس ناکەین بە هاوبەشی پەروەردگارمان.**

**٧. وە دەڵێن شەیتان فریوی داوین کە ڕێگای پێچەوانەی تەوحیدی فێرکردون، وە کە پێی وتون خوای گەورە خێزان و ڕۆڵەی هەیە:** وَأَنَّهُۥ كَانَ يَقُولُ سَفِيهُنَا عَلَى

ٱللَّهِ شَطَطًا (الجن: ٤) **بێگومان بێ ئاوەزەکەمان درۆی نالەباری هەڵدەبەست دەربارەی خوا.**

٨. وَأَنَّا ظَنَنَّآ أَن لَّن تَقُولَ ٱلْإِنسُ وَٱلْجِنُّ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا (الجن: ٥) **وە ئێمە پێمان وابوو کە ئادەمیی و جنۆکە هەرگیز درۆ ناکەن دەربارەی خوا. ئەوان قەناعەتی خۆیان سەبارەت بە خوا لە گەڵ جنۆکە گرێداوە .**

٩. وَأَنَّا لَا نَدْرِىٓ أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَن فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ أَرَادَ بِهِمْ رَبُّهُمْ رَشَدًا (الجن: ١٠) **وە بەڕاستی نازانیین ئایا خراپی ویستراوە بۆ ئەوانەی کە لە سەر زەوین یا پەروەردگاریان ڕێنموونیی ویستووە بۆیان.**

١٠. **وە دەڵێن چاک و خراپ و ڕێگای جیاوازمان هەیە :** وَأَنَّا مِنَّا ٱلصَّٰلِحُونَ وَمِنَّا دُونَ ذَٰلِكَ كُنَّا طَرَآئِقَ قِدَدًا (الجن: ١١) **وە بێگومان ئێمە هێندێکمان چاکیین وە هێندێکمان لەوە نزمترین ئێمە جاران خاوەنی ڕێبازی زۆر بووین.**

١١. وَأَنَّا لَمَّا سَمِعْنَا ٱلْهُدَىٰٓ ءَامَنَّا بِهِۦ فَمَن يُؤْمِنۢ بِرَبِّهِۦ فَلَا يَخَافُ بَخْسًا وَلَا رَهَقًا (الجن: ١٣) **بەڕاستی ئێمە کاتێك گوێمان لە بانگەوازی هیدایەت بوو، یەکسەر باوەڕمان پێکرد، جا ئەوەی ئیمان بهێنێت بە پەروەردگاری، ئیتر ناترسێت لەوەی، کردەوە چاکەکانی بێ نرخ تەماشا بکرێت، لە گوناهەکانیشی چاوپۆشی نەکرێت. ئەم ئایەیە زۆر ڕوونە کە ئیمانیان بە قورئان هێناوەو تەسلیم بوون.**

١٢. **وە دەڵێن ئیمەو مسوڵمان و خراپەکارمان هەیە، ئەو قسەیە دوای ئەو ڕووداوە دێ کە ئیمانیان هێناوە بە قوڕئان.**

١٣. **وە خوای گەورە دەفەرموێ لە سورەتی (الاحقاف):** وَإِذْ صَرَفْنَآ إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقُرْءَانَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوٓا۟ أَنصِتُوا۟ فَلَمَّا قُضِىَ وَلَّوْا۟ إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ (الأحقاف: ٢٩) **یادی ئەوەش بکە کاتێک ئێمە دەستەیەک پەریمان لادایە لای تۆ،**

تا گوێ لەقورئان بگرن، ئەوسا ئامادەبوون و بەیەکتریان وت : گوێ بگرن و بێ دەنگ بن، کاتێک قورئان خوێندنەکە تەواو بوو، پەریەکان گەڕانەوە بۆ ناو هۆزو قەومەکەیان و، دەستیان کرد بەئاگادارکردنەوەو بانگکردنیان بۆ پەیرەوی کردنی ئەم ئاینە نوێیە.

ئەم ئایەتە لەزۆر ڕووەوە بەڵگە کە ئەوان وەک ئێمە مکلف ن بە قورئانی پیرۆز چونکە خوای گەورە ئەوانی وا لێکرد کە گوێ لە پێغەمبەر بگرن، وە ئەوان تەواو گوێ یان گرت و بێدەنگ بوون، وە ئەوان گەڕانەوە ناو هۆزەکان بۆ ورياکردنەوە (منذرين)، ئەوان دەڵێن ئێمە گوێمان لە کتابێک بوو کە لەدوای موسا دابەزیوە، تەسدیق و پشتیوانی کتابەکانی تر دەکا، دەکرێ ئەم جنۆکانە جولەکە بوبن، وە دەڵێن قورئان بانگەشە بۆ ڕێگای ڕاستدەکات: قَالُواْ يَٰقَوْمَنَآ إِنَّا سَمِعْنَا كِتَٰبًا أُنزِلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِيٓ إِلَى ٱلْحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ (الأحقاف: ٣٠) وتيان ئەی هۆزو قەومەکەمان بەڕاستی ئێمە گوێ بیستی کتێبێك بووین کە لەپاش مووسا نێردراوەتە خوارەوە پەڕاوەکانی پێش خۆی بەڕاست دادەنێ (خەڵك) ڕێنموونی دەکات بۆ هەق بۆ ڕێبازی ڕاست.

وە داواش لە گەلەکەیان دەکەن وەڵام قورئان وپێغەمبەر بدەنەوە، چونکە وەڵامدانەوە هۆکاری لێخۆشبون و لە ئاگر پارێزرانە، وە هەرەشە دەکەن: ئەگەر هەرکەسێک بەدەم ئەم بانگخوازو دڵسۆزیەوە نەچێ لە دەستی خوای گەورە قوتار نابێ، ئەم ئایەتانە زۆر بە ڕوونی باسی ئیمانی ئەو جنۆکانە دەکەن بە قورئان و بە پێغەمبەرەکەی

١٤. بەڵگەیەکی تر لە سەر ئەوەی ئەوان وەک مرۆڤ مکلف ن ئەوەیە لە دوا ڕۆژدا جنۆکەو مرۆڤ گازندە لە یەکتر دەکەن، ئەگەر ئەرکەکەیان یەک نیەو پەیوەندیان بە یەکەوە نییە چۆن گلەیی لە یەکتر دەکەن!؟: وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا يَٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ قَدِ ٱسْتَكْثَرْتُم مِّنَ ٱلْإِنسِ وَقَالَ أَوْلِيَآؤُهُم مِّنَ ٱلْإِنسِ رَبَّنَا ٱسْتَمْتَعَ بَعْضُنَا

بِبَعْضٍ وَبَلَغْنَآ أَجَلَنَا ٱلَّذِىٓ أَجَّلْتَ لَنَا قَالَ ٱلنَّارُ مَثْوَىٰكُمْ خَٰلِدِينَ فِيهَآ إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ (الأنعام: ١٢٨) **ڕۆژێک دێت خوا هەمووانیان کۆ دەکاتەوە و (بەخەشم و قینەوە دەفەرموێت): ئەی دەستەی پەریەکان بەڕاستی ئێوە زۆر کەستان لە ئینسانەکان گومڕاکرد، لەولاشەوە گوێ لە مشتەکانیان، (لە خەڵکی نەگبەت و ڕەنجەڕۆ) دەڵێن: پەروەردگارا هەندێکمان سوودمان لە هەندێکیان وەرگرت (سوودی ئینسانەکان ڕابواردن سامان کۆکردنەوە بوو، سوودی پەریەکانیش پێڕی خۆیانیان زۆرکرد بەگومڕاکردنی خەڵکێکی زۆر)، ئێستاش ئەوەتە گەیشتووینەتە ئەوکات و ساتەی تۆ بۆت دیاری کردووین، خوایش فەرمووی: (مادەم وایە) ئەم ئاگرە جێگەتانە نەمرن تیادا، مەگەر خوا ویستی لەسەر بێت (بە سزایەکی تر سزایان بدات)، بەڕاستی پەروەردگاری تۆ (ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم) ئەی ئیماندار) داناو زانایە.**

وَلَا تَأْكُلُوا۟ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُۥ لَفِسْقٌ وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِهِمْ لِيُجَٰدِلُوكُمْ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ (الأنعام: ١٢١) **لەو ئاژەڵە سەر بڕاوانەش مەخۆن کە ناوی خوا لەکاتی سەر بڕینیاندا نەبراوە و بەڕاستی ئەوە لادان و گوناهە، دڵنیابن کە شەیتانەکان شت دەخەنە دڵی لایەنگرەکانیانەوە تا موجادەلەتان لەگەڵ بکەن و(بەرگری لە بەتاڵیان بکەن) جا ئەگەر ئێوە فەرمانبەرداری ئەو هاوەڵگەرو شەیتانانە بن، ئەوە بێگومان مانای وایە ئێوەش موشریک و هاوەڵگەرن.**

**مادام پێغەمبەر ڕەحمەت بێ بۆ جیهانیان ئەوانیش بەشێکن لەو جیهانیانە.**

**١٥. وە ئیبن تەیمیەو شیبلی و رازی و زۆرێک لە زانایان دەڵێن هیچ ڕاجیاییەک نییە لە سەر ئەوەی جنۆکە مکلفن.**

**١٦. وە ئەگەر لە گەڵ ئێمەدا خاوەن ئەرک نین بۆچی خوای گەورە بەو وردەکارییە باسیان دەکا؟.**

**١٧. وە خوای گەورە سزای هەردوولای لە گەڵ یەک باسکردوە وەک دەفەرموێ:** وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ ءَاذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَآ أُوْلَٰٓئِكَ كَٱلْأَنْعَٰمِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْغَٰفِلُونَ (الأعراف: ١٧٩) **سوێند بە خوا بێگومان ئێمە زۆر لە پەری و ئادەمیزادمان بۆ دۆزەخ دروست کردوە، ئەوانە دەزگای دڵیان هەیە و کەچی حەقی پێ تێناگەن، چاویشیان هەیە کەچی حەقی پێ نابینن، گوێیان هەیە کەچی حەقی پێ نابیستن، ئا ئەوانە وەکو ئاژەڵ وان ( لە شوێنکەوتنی ئارەزوودا) بەڵکو ئەوانە وێڵ تریشن، ئا ئەوانە هەر غافڵ و بێ ئاگان لە حەق.**

١٨. قَالَ ٱدْخُلُواْ فِيٓ أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُم مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ فِي ٱلنَّارِ كُلَّمَا دَخَلَتْ أُمَّةٌ لَّعَنَتْ أُخْتَهَا حَتَّىٰٓ إِذَا ٱدَّارَكُواْ فِيهَا جَمِيعًا قَالَتْ أُخْرَىٰهُمْ لِأُولَىٰهُمْ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ أَضَلُّونَا فَـَٔاتِهِمْ عَذَابًا ضِعْفًا مِّنَ ٱلنَّارِ قَالَ لِكُلٍّ ضِعْفٌ وَلَٰكِن لَّا تَعْلَمُونَ (الأعراف: ٣٨) **خوا پێیانی فەرموو ئێوە لەگەڵ ئۆممەتانێك كە لەپێش ئێوەوە بوون لە جنۆکە و ئادەمی بچنە ئاگری دۆزەخەوە هەر جارێ دەستەیەك دەچنە ناویەوە نەفرین لە هاوبیرانی دەكات هەتا هەموو دەگەن بەیەك و كۆدەبنەوە یەك دەگرن دوایی یەكانیان (كە شوێن كەوتوو بوون) دەربارەی پێشوەكانیان (كە پێشەوا بوون) دەڵێن ئەی پەروەردگارمان ئەوانە ئێمەیان گومڕا كرد دە تۆش لە ئاگردا دووقات سزایان بدە (پەروەردگار) دەفەرموێ بۆ هەركامتان (سزا) دوو بەرامبەرە بەڵام ئێوە نازانن و بێ ئاگان.**

**١٩. وە خوای گەورە دەفەرموێ:** وَلَوْ شِئْنَا لَءَاتَيْنَا كُلَّ نَفْسٍ هُدَىٰهَا وَلَٰكِنْ حَقَّ ٱلْقَوْلُ مِنِّي لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ (السجدة: ١٣) **ئەگەر بمانویستایە ڕێنموونیمان بە هەموو کەسێ دەدا بەڵام بەڵێنی من چەسپاو جێگیر بووە کە بێگومان دۆزەخ پڕ دەکەم لە پەری و ئادەمی تێکڕا.**

٢٠. هەروەکو چۆن بە یەکەوەش کاری وەسوەسەو گومڕاکردن ئەنجامدەدەن: ٱلَّذِى يُوَسْوِسُ فِى صُدُورِ ٱلنَّاسِ (الناس: ٥) ئەوەی کە وەسوەسە ئەخاتە دڵی خەڵکی. مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ (الناس: ٦)لە پەری و خەڵکی ( لە جنۆکە و ئینسان ئەوانەی شەیتان سیفەتن ).

**ئایا پێغەمبەر جنۆکەی بینیوە؟:**

زۆر بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەئ کە پێغەمبەر ئەوانی بینیوە، ڕاستەو خۆ، وە نا ڕاستەوخۆ، لەو بەڵگانە:

**أ.** مادام پێغەمبەر بۆ ئەوانیش هاتبێ وەک لە بەڵگەی زۆردا باسمانکرد ناکرێ ئەوانی نەبینیبێ.

**ب.** فەرمودەکەی عبدالله کوردی مەسعود بە ڕوونی باسی وەفدی جنۆکەو چونی پێغەمبەر علیه أفضل الصلوات واتم التسليمات والتبريكات، دەکات: عَنْ عَامِرٍ ، قَالَ : سَأَلْتُ عَلْقَمَةَ ، هَلْ كَانَ ابْنُ مَسْعُودٍ شَهِدَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيْلَةَ الْجِنِّ ؟ قَالَ : فَقَالَ عَلْقَمَةُ : أَنَاَ سَأَلْتُ ابْنَ مَسْعُودٍ ، فَقُلْتُ : هَلْ شَهِدَ أَحَدٌ مِنْكُمْ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيْلَةَ الْجِنِّ ؟ قَالَ : لَا، وَلَكِنَّا كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ذَاتَ لَيْلَةٍ، فَفَقَدْنَاهُ، فَالْتَمَسْنَاهُ فِي الْأَوْدِيَةِ وَالشِّعَابِ، فَقُلْنَا : اسْتُطِيرَ ، أَوِ اغْتِيلَ. قَالَ : فَبِتْنَا بِشَرِّ لَيْلَةٍ بَاتَ بِهَا قَوْمٌ، فَلَمَّا أَصْبَحْنَا إِذَا هُوَ جَاءٍ مِنْ قِبَلِ حِرَاءٍ. قَالَ : فَقُلْنَا : يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَدْنَاكَ، فَطَلَبْنَاكَ، فَلَمْ نَجِدْكَ، فَبِتْنَا بِشَرِّ لَيْلَةٍ بَاتَ بِهَا قَوْمٌ. فَقَالَ : " أَتَانِي دَاعِي الْجِنِّ، فَذَهَبْتُ مَعَهُ، فَقَرَأْتُ عَلَيْهِمُ الْقُرْآنَ ". قَالَ : فَانْطَلَقَ بِنَا، فَأَرَانَا آثَارَهُمْ وَآثَارَ نِيرَانِهِمْ، وَسَأَلُوهُ الزَّادَ. فَقَالَ : لَكُمْ كُلُّ عَظْمٍ ذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ يَقَعُ فِي أَيْدِيكُمْ أَوْفَرَ مَا يَكُونُ لَحْمًا وَكُلُّ بَعْرَةٍ عَلَفٌ لِدَوَابِّكُمْ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " فَلَا تَسْتَنْجُوا بِهِمَا، فَإِنَّهُمَا طَعَامُ إِخْوَانِكُمْ ، رواه البخاری ،٤٥٠ لە عامیرەوە دەڵێ: پرسیارم لە عەلقەمە کرد ئایا ئیبن مەسعود لە گەڵ پێغەمبەری خوا لە شەوی چون بۆ لای جنۆکە ئامادە بوو؟ عەلقەمەش وتی منیش هەمان پرسیارم لە پێغەمبەر کرد ئایا لە گەڵ پێغەمبەری خوا لە گەڵ جنۆکەکان ئامادە بوی؟ وتی: نا، بەڵام ئێمە

شەوێک لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا بوین، بزرمان کرد لێی گەڕاین لە شیوو ڕێگاو بانەکان نەماندۆزیەوە، وتمان لە وانەیە فڕێندرابێ یان تیرۆر کرابێ، خراپترین شەوێک بو ئەو شەوە کە خەڵکێک بەسەری بەرێ لە ناڕەحەتی، کاتی بەیانی بینیمان لە لای کێوی حەڕاوە دەهاتەوە، وتمان ئەی پێغەمبەری خوا بزرمان کردی، بە دوتدا گەڕاین نەماندۆزیەوە، ئێمە خراپترین شەوێکمان بەسەر برد لە ناڕەحەتیا، پێغەمبەریش فەرموی: نوێنەرێکی جنۆکەکان هات بە دومدا، منیش لە گەڵی ڕۆیشتم، قورئانم بەسەردا خوێندنەوە، پێی وتم وەرە لە گەڵمان واتە پێغەمبەر بە عبداللەی فەرموی وەرە لە گەڵمان، شوێنەوارو شوێنی ئاگرکردنەوەیانی نیشان داین.....

ئەم فەرمودەیە ڕوونترین فەرمودەیە لەسەر ئەو بابەتە کە پێغەمبەر ئەوانی بینیوە علیە الصلاە والسلام.

**ت.** فەرمودەکەی ئیبن عەباس کە نەفی بینینی پێغەمبەر دەکا بۆ جنۆکە کە دەفەرموێ: ما قرأ رسولُ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم على الجنِّ وما رآهم ، انطلق رسولُ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم في طائفةٍ من أصحابِه عامدين إلى سوقِ عُكاظٍ ، وقد حِيل بين الشَّياطينِ وبين خبرِ السَّماءِ ، وأُرسِلتْ عليهم الشُّهبُ ، فرجعت الشَّياطينُ إلى قومِهم ، فقالوا : ما لكم ؟ قالوا : حِيل بيننا وبين خبرِ السَّماءِ ، وأُرسِلتْ علينا الشُّهبُ ، قالوا : ما حال بينكم وبين خبرِ السَّماءِ إلَّا من أمرٍ حدث ، اضرِبوا مشارقَ الأرضِ ومغاربَها ، فانظُروا ما هذا الَّذي حال بينكم وبين خبرِ السَّماءِ ، انطلَقوا مشارقَ الأرضِ ومغاربَها يبتغون ما حال بينهم وبين خبرِ السَّماءِ ، انصرف أولئك النَّفرُ الَّذين توجَّهوا نحوَ تِهامةَ إلى رسولِ اللهِ صلَّى اللهُ عليه وسلَّم ، وهو وأصحابُه بنخلةٍ عامدين إلى سوقِ عُكاظٍ ، وهو يُصلِّي بأصحابِه صلاةَ الفجرِ ، فلمَّا سمِعوا القرآنَ استمعوا قالوا : هذا واللهِ الَّذي حال بينكم وبين خبرِ السَّماءِ ، فهنالك حين رجعوا إلى قومِهم ، فقالوا : إنَّا سمِعنا قرآنًا عجَبًا ، يَهدي إلى الرُّشدِ فآمنَّا به ولن نُشرِكَ بربِّنا أحدًا ، فأنزل اللهُ عزَّ وجلَّ على نبيِّه صلَّى اللهُ عليه وسلَّم : قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِنَ الْجِنِّ وإنَّما أُوحِي إليه قولُ الجنِّ

الراوي : عبدالله بن عباس | المحدث : أبو نعيم | المصدر : حلية الأولياء | الصفحة أو الرقم : 332/4 | خلاصة حكم المحدث : صحيح متفق عليه [أي:بين العلماء] | التخريج : أخرجه البخاري (773)، ومسلم (449) باختلاف يسير، وأبو نعيم في ((حلية الأولياء)) (300/4) واللفظ له

**ئەم فەرمودەیە بە پێی ئەم روداوە کە هاتوە راستە پێغەمبەر ئاگاداری ئەوان نەبوەو ئەوانی نەبینیوە چونکە ئەمە یەکەم ڕوداو بوە کە پێغەمبەریش پێی ئاگادار نەبوە دواتر لە سورەت الجن و کۆتایی سورەتی الاحقاف ئەم روداوە بۆ پێغەمبەر گێردراوەتەوە.**

**ث. دواتر عەبدوالله ی کوڕی عباس نەفی دەکا، بەڵام عبد والله کوری مەسعود ئیسپاتی دەکا، بە پێی زانستی فەرمودەناسی ئەوەی ئیسپات دەکا زانستی زیاتری پێ یە لەوەی کە نەفی دەکا.**

**ج. ئیبن مەسعود خۆی لە گەڵ ڕوداوەکە بوە بەڵام ئیبن عەباس لە گەڵدا نەبوە.**

**ح. ئیبن عەباس لە گەڵ پێغەمبەر نەژیاوە چونکە ئەو لە مەککە بوە، ئەو پێش کۆچ مناڵ بوە، وە لە دوای کۆچ مەگەر لە فەتحی مەکەدا پێغەمبەری بینبێ، بەڵام ئیبن مەسعود گەورە بوە لە مەکەو مەدینەدا لە خزمەت پێغەمبەردابوە.**

**خ. بێجگە لەوەش دەوترێ ئیبن عەباس لە بۆچونەکەی پاشگەز بۆتەوە، وە ئەگەر ئەمەش ئیسپات نەبێ لە نێوان قسەی ئەم دوو هاوەڵە بەڕێزەدا ناکۆکی و دژ بە یەکی نییە چونکە ئەو ڕووداوەی ئیبن عەباس ئەم قسەی لەسەر دەکا تەواوە ئەوکات پێغەمبەر ئەوانی نەنینەوەو هەستی بەوان نەکردوە، بەڵام دواتر پێغەمبەری خوا لە زۆر شت ئاگادار بوە.**

**د. یاسایەکمان هەیە زۆر جوانە کە دەڵێ: الاعتبار بكمال النهاية لا بنقص البداية.**

**ذ.** ئێمە یاسایەکی ترمان هەیە کە دەڵێ : إعمال الدليلين خير من إهمال أحدهما.

**ذ.** وە ئێمە بەڵگەی زۆر ڕوونمان هەیە لە سەر ئەوەی کە پێغەمبەر عليه الصلاة والسلام جنۆکەی بینیوە وەک دەفەرموێ: عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ، قَالَ : قَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَسَمِعْنَاهُ يَقُولُ : " أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْكَ "، ثُمَّ قَالَ : " أَلْعَنُكَ بِلَعْنَةِ اللَّهِ "، ثَلَاثًا، وَبَسَطَ يَدَهُ كَأَنَّهُ يَتَنَاوَلُ شَيْئًا، فَلَمَّا فَرَغَ مِنَ الصَّلَاةِ. قُلْنَا : يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَدْ سَمِعْنَاكَ تَقُولُ فِي الصَّلَاةِ شَيْئًا لَمْ نَسْمَعْكَ تَقُولُهُ قَبْلَ ذَلِكَ، وَرَأَيْنَاكَ بَسَطْتَ يَدَكَ. قَالَ : " إِنَّ عَدُوَّ اللَّهِ إِبْلِيسَ جَاءَ بِشِهَابٍ مِنْ نَارٍ ؛ لِيَجْعَلَهُ فِي وَجْهِي، فَقُلْتُ : أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْكَ، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ. ثُمَّ قُلْتُ : أَلْعَنُكَ بِلَعْنَةِ اللَّهِ التَّامَّةِ فَلَمْ يَسْتَأْخِرْ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ. ثُمَّ أَرَدْتُ أَخْذَهُ، وَاللَّهِ لَوْلَا دَعْوَةُ أَخِينَا سُلَيْمَانَ لَأَصْبَحَ مُوثَقًا يَلْعَبُ بِهِ وِلْدَانُ أَهْلِ الْمَدِينَةِ ، رواه مسلم. ٥٤٢ ، ئەبودەردا دەفەرموی پێغەمبەری خوا عليه الصلاة والسلام لە نوێژدا ڕاوەستابو گوێمان لێبو دەیفەرمو: پەنا دەگرم بە خوا لە تۆ. لە پاشان فەرموی: نەفرینت لێدەکەم بە نەفرینی خوا، سێ جار وای فەرموو، وەدەستی ڕاکێشا وەک ئەوەی کە شتێک بگرێ، کاتێک جەنابیان نوێژەکەی تەواوکرد وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا گوێمان لێبو لە نوێژا شتێکت فەرموو کە پێشتر لە نوێژدا شتی وامان لە نەبیستبو، بینیمان دەستت کردبۆوە، ئەویش فەرموی: دوژمنی خوا ئیبلیس هات بە سەلکە بزوتێکەوەواتە بە ئاگرێکەوە بۆ ئەوەی لە دەم و چاومی بدا، منیش سێ جار وتم پەنا دەگرم بە خوا لە تۆ، لە پاشان وتم بە نەفرینی خوا نەفرینت لێدەکەم، سێ جار وام وت دوور نەکەوتەوە، دواتر ویستم بیگرم بەڵام دواتر دوعاکەی سولەیمان بیر کەوتەوە کەوتی ئەی پەروەردگار دەسەڵاتێکم پێبدەی کە نەدرێتە هیچ کەس لە دوای من، ئەگەر ئەو نزایەو داوایەیی سولەیمان نەبوایە دەمبەستەوە مناڵەکانی مەدینە گاڵتەیان پێکردبا.

کەواتە فەرمودەکە باس لەوە دەکا ئەگەر نزاکەی سولەیمان نەبا منالٚی مەدینەش دەیانبینی.

**ر.** پێغەمبەری خوا بەهەشت و دۆزەخی بینیوە کە زۆر لە جنۆکە گرنگترو گەورەترە.

**ز.** پێغەمبەری خوا جبریلی بینیوە کە زۆر بەتواناو بە هێزە کە زۆر لە ئیبلی و جنۆکە گرنگترە.

**س.** پێغەمبەری خوا گەورەترین مەخلوقە ئەمە بۆ ئەو مەحاڵ و مستحیل نییە، وە خوای گەورە کە نەفی بینینی ئێمەی بۆ ئەوان کردوە، ئەوە بە ڕەهایی نەفی نەکردوە بەڵکو حەیسیەت و کەیفیەتی دیاری کردوە، واتە وەک ئەوان ئێوە دەبینن ئێوە بەو کەیفیەتە ئەوان نابینن نەوەک هەر نایبینین، بۆیە ئەوانەی باس لەوە دەکەن پێغەمبەر جنۆکەی نەبینیوە لە دەلیلی نەقلّی واقعی زۆر بێ ئاگان، چ جای بگاتە وتەی زانایان.

## تەوەری نۆیەم

### چۆن خۆمان بپارێزین لە شەیتان و جنۆکەو زیانەکانیان؟

وەک لە پێشتر باسمانکرد مادام جنۆکەو شەیتان ئەوەندە کاریگەرو خراپەیان هەیە، وە ئەمە سەلمێنراوە لە قورئان و سونەت و هەموو دینە ئاسمانیەکان پێویستە ئێمە خۆمانیان لێ بپارێزین

١. یەکەم ڕێگا بۆ خۆپاراستن لە شەیتان ئیمان، بەندایەتی، یەکلابونەوە: الایمان، والعبودية، والاخلاص) ئەم سێ ڕێگایە لە فەرمایشتی خوای گەورە، وە لە دانپێداهێنانی شەیتان خۆی فێری دەبین کەخوای گەورد دەفەرموێ: قَالَ رَبِّ بِمَآ أَغْوَيْتَنِي لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ (الحجر: ٣٩) وتی ئەی پەروەردگارم لەبەر ئەوەی گومڕات کردم بێگومان خۆشی دنیایان لە زەوی دا بۆ دەڕازێنمەوە وە بەڕاستی هەموویان گومڕا دەکەم: إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ( ٤٠ الحجر) بەندە دڵسۆزەکانت نەبێت.

کەسێک ئیمانی تەواوی بە خوایەتی خوا هەبێ و بەندەی ئەو بێ وخۆی ساغ و یەکلاکاتەوە شەیتان دەرەقەتی نایا.

٢. ئیمان هاوکات لە گەڵ پشت بەستن بە خوای گەورە: إِنَّهُۥ لَيْسَ لَهُۥ سُلْطَٰنٌ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ (النحل: ٩٩) بە ڕاستی ئەو (شەیتان) دەسەڵاتی نی یە بەسەر ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و تەنها پشتیان بە پەروەردگاریان دەبەستن.

٣. قورئان خوێندن، چونکە پەتی نەجاتە لە زیان: فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ (النحل: ٩٨) ئەی (موحەممەد (صلى الله عليه وسلم))

**کاتێ ویستت قورئان بخوێنی پەنا بگرە بە خوا لە شەیتانی دەرکراو لەبەزەیی خوا.**

**٤. زیکری خوا بە شێوەیەکی گشتی:** إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ إِذَا مَسَّهُمۡ طَٰٓئِفٌ مِّنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُّبۡصِرُونَ (الأعراف: ٢٠١) **بەڕاستی ئەوانەی خواناس و پارێزکار بوون کاتێك خەتەرو وەسوەسەیەکیان لەشەیتانەوە پێ بگات یادی خوا دەکەن و خوایان بیر دەکەوێتەوە جا کوت وپڕ بەرچاویان ڕۆشن دەبێتەوە واتە ڕاستی دەدۆزنەوە.**

**٥. نوێژکردن گەورەترین بەندایەتیە بە فەرزو سونەتەوە:** إِنَّ ٱلَّذِينَ يَتۡلُونَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُواْ مِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ سِرًّا وَعَلَانِيَةً يَرۡجُونَ تِجَٰرَةً لَّن تَبُورَ (فاطر: ٢٩) **بەڕاستی ئەوانەی کە کتێبی خوا دەخوێننەوە و بەچاکی نوێژیان بەجێ هێناوە وە لەوەی کەپێمان داون بە نهێنی و ئاشکرا دەبەخشن چاوەڕوانی بازرگانییەکن هەرگیز زەرەر ناکات.**

**٦. پەنا بردن بۆ خوای گەورەو یادکردنی لە و شوێنانەدا کە دانراوە، بۆ نمونە :**

- **چونە مزگەوت**
- **هاتنەدەر لە مزگەوت**
- **کاتی جوتبون**
- **چونە سەرئاو**
- **کاتی نوێژ**
- **کاتی قورئان خوێندن**
- **کاتی پۆشینی شتومەک**



- ❖ چویە شوێنێکی چۆل و ویستت بمێنییەوە
- ❖ هەستت بە وەسوەسە کرد
- ❖ ترسای لە حەسودی
- ❖ کاتی تورەی
- ❖ کاتی نوستن
- ❖ کاتی لە خەو هەستان
- ❖ بەیانی و ئێواران

زۆر شت وەک لە کتابەکانی تایبەت بەو بوارە هاتون وەک ( الاذکار ی ئیمامی نەوەوەی) تحفه الذاکرین ی شەوکانی، قەڵای مسوڵمان و زۆر سەرچاوەی تر.

٧. هەموو هۆکارەکانی بە هێزکردنی ئیمان.

٨. هاورێ یەتی مرۆڤی باش.

٩. چاک لەگەڵ دایک و باوک و کەس و کارو هەژاران.

١٠. پاڕانەوە.

١١. ڕەواندنەوەی گومانەکان.

١٢. حەج و عەمرەکردن ئیمان و یەقین زیاد دەکا.

١٣. بەڕۆژو بون.

١٤. بەشداری جەماعەت لە مزگەوت.

١٥. خۆ خەریک کردن بە کاری باش.

١٦. ڕێکخستنی کاتی خەوو خۆراک.

١٧. بیرکردنەوە لە دوا ڕۆژ.

١٨. خوێندنەوەی ئەو کتابانەی کە پلانەکانی شەیتانت پێ دەناسێنێ وەک (تلبيس إبليس، إغاثة اللهفان، إرواء الظمآن بأخبار الشيطان، البيان لما ورد عن الشيطان...)

١٩. خوێندنەوەی کتابەکانی تەزکییە بە کوردی و عەرەبی.

٢٠. چیرۆک و سەربوردەی پیاو چاکان زۆر کاریگەری هەیە بۆ زاڵبون بەسەر شەیتان.

٢١. بیرکردنەوە لە سەرەنجامی گوێڕایەڵی جنۆکەو شەیتان.

٢٢. خواردنی حەڵاڵ.

٢٣. هەبونی مامۆستاو مورشید یان لانی کەم هاوڕێی باش.

٢٤. وریابون لە هەنگاوەکانی شەیتان کە دەیەوێ:

- کافرمانکا ئەگەر بتوانێ.
- یان توشی بیدعەمان کا، بیدعە هەرە جۆرە خراپەکەی لادانە لە پەیرەوی ئاپۆرای ئومەتی ئیسلامی و تەفرەقە خستنەوە لەناو کۆمەڵگای مسوڵمانانە بە ناڕەوا.
- گوناهی گەورە پێکردن.
- ئەگەر ئەوەی پیشوتر نەکرا گوناهی بچوک پێکردن.
- ئەگەر نەکرا سەرقاڵکردنە بە شتە حەڵاڵەکان و تێدا ڕۆچونە.

- سەرقاڵ کردنی مرۆڤ بە چاک لە چاکتر.
- لانی کەم وەسوەسە پەیداکردن.

٢٥. بێ هیوا نەبون لە ڕەحمەتی خوا.

٢٦. مەغرور نەبون بە ڕەحمەتی خوا.

٢٧. دورکەوتنەوە لە شوێنی خراپ.

٢٨. گۆرانی و مۆسیقای فاحش و بێکەڵک و وروژێنەر بۆ خراپە.

٢٩. دورکەوتنەوە لە گروپ و حیزب و ناوەندی خراپ.

٣٠. خۆ پاراستن لەو کتابانەی کەڕاتدەکێشن بۆ نێو دونیای جنۆکەو جادو بە بێ زانیاری و دامەزراوی.

٣١. هاوسەرگیری.

٣٢. خوێندنی ئیخلاص و فلق و ناس.

٣٣. خوێندنی ئایەتەلکورسی.

٣٤. خوێندنی سورەتی بەقەرە.

٣٥. دورکەوتنەوە لە فاڵچی و جادوگەرەکان.

٣٦. وریابون لە تێکەڵبونی ناشەرعی.

٣٧. تێکەڵنەبون لە سایت و ناوەندەخراپەکان چونکە کاتی زۆرت دەباو دڵتەنگت دەکاو توشی تاوان و وەسوەسەت دەکات.

٣٨. نەترسان لە غەیری خوا.

٣٩. زیاد قسە نەکردن چونکە مرۆڤ توشی خلیسکان و تاوان دەکا.

٤٠. زیاد نەخواردن چونکە مرۆڤ تەمبەڵدەکا لە عیبادەت.

٤١. قسەی چاک کردن.

٤٢. خۆسەرقاڵکردن بە دەرس و دیراسەی پڕ خێر.

٤٣. پتەو کردنی پەیوەندی خێزانی.

٤٤. خێرو سەدەقە.

٤٥. زەردەخەنە کردن و ڕووبەڕووبونەوەی خەڵک بە ڕووی خۆش.

٤٦. داوای دوعا بکە لە دایک و باوک و مرۆڤە باشەکان.

٤٧. سەردانی قەبرستان و خەستەخانەو ئەو شوێنانەی کە دڵت نەرم دەکەن.

٤٨. بە جوانی بەکارو ئەرکەکانت هەستە چونکە تەمبەڵی لە ئەرکەکانت بێزارو بێزراوت دەکات و خەمبارت دەکا.

٤٩. خۆپاراستن لە تورەیی بە بێ پێویستی.

٥٠. کاری بانگەوازی زۆر بەرەکەتدارە.

٥١. ناسینی حەقیقەتی دونیا.

٥٢. شارەزای سیرەی سەروەرمان و هاوەڵان و پیاو چاکان تەواو یەقین زیاد دەکاو جێگا بۆ وەسوەسەو گومان ناهێڵێتەوە.

٥٣. پاک و خاوێنی لاشەو دەرون.

٥٤. بۆنی خۆش بەکار بێنە.

٥٥. لە شوێنی پیس مەمێنەوە.

٥٦. خواردنێک مەخۆ گوماناویبێ، وە ئەگەر گوماناویش نەبوو زیادە ڕەوی تێدا مەکە.

٥٧. خۆت هەڵمەقورتێنە لە کاری جنۆکەو ئەو شتانەی کە پەیوەندی بەو بوارەوە هەیە بە بێ زانیاری تەواو.

٥٨. دەمارگیر مەبە بۆ بۆچونی خۆت پێت وانەبێ هەقی ڕەها لای تۆیە.

٥٩. خۆت دووربگرە لە کەسە نەگونجاوو توندڕەوەکان چونکە وات لێدەکەن تەنیا خۆت و گروپەکەت پێ ڕاست بێ.

٦٠. گومانی باش بە خەڵک بەرێ مەگەر بۆ کەسێک جێگای گومانبێ.

٦١. تەوبەکردن و پەشیمانبونەوە.

٦٢. تەواو لە قەدەر تێبگەو بیانو بە قەدەر مەگرە.

٦٣. لەگەڵ وەسوەسەی خراپ بێ هیوا مەبە چونکە ئەوە نیشانەی ئیمانە.

٦٤. لێبوردی دەرون ئاسودە دەکا.

٦٥. وەرزش دەرو دەرون خۆشدەکا.

٦٦. حەسودی بەکەس مەبە مەگەر بۆ کاری چاکە ئەوکات پێشبڕکێ ی لە گەڵدا بکەو نزای بە خێریش بۆ بەرامبەرت بکە.

٦٧. کاتە زێڕینەکان بقۆزەوە بۆ بەندایەتی و نزاکردن وەک :

- کاتی سەجدە
- کاتی تەحیات

- كاتی پارشێو
- كاتی ڕۆژو شكاندن
- شەوانی قەدر
- ڕۆژی هەینی
- لە شوێنە تايبەتەكان لە كاتی حەج و عەمرە
- نزای دايک و باوک
- كاتی باران بارين
- كاتی نەخۆشی
- بەيانی و ئێواران
- ئەوكاتەی دڵت خۆش و ڕوونە بە عيبادەت
- بە ڕۆژو بونی سونەتەكان بە تايبەت عارەفە، نۆيەم و دەيەمی موحەرەم، هەر مانگێک سێ ڕۆژ ، دوو شەم و پێنج شەم.

٦٨. زۆر سود لە خۆت وەربگرە بزانە بەچی ئيمانت زيادەكاو زۆر سود وەردەگری، وە بەچی ئيمانت لاواز دەبێ و توشی وەسوەسە دەبی.

٦٩. خۆت بەكەم مەزانە تۆ زۆر لە جنۆكە بەهێزتری ، تواناى ئەوان بەسەر كەسانی گوناهبارو ترسنۆک و لاوازدايە.

٧٠. شەرت نيە ئەوانەی باسكران بتوانی هەموويان جێبەجێ بكەی بزانە سود لە كامەيان زياتر وەردەگری پێيەوە پابەند بە.

٧١. یەقینت بە خوا بێ کە ئەو خۆشتی دەوێ وخێری بۆتدەوێ زۆر ئیلحاح بکە لە نزاکردندا.

٧٢. هەتا دەتوانی یارمەتیدەری ئەوانە بە کە توشی دەردی وەسوەسەو جنۆکە بون.

٧٣. متمانە بە هەموو کەس مەکە.

٧٤. پشت بە خوا ببەستەو متمانەت بە خۆتبێ ئەمە کلیلی سەرکەوتنە.

٧٥. ژیانی مرۆڤە سەرکەوتوەکان بخوێنەوە لە ژیاندا زۆر بەهێزت دەکا.

٧٦. با کەسابەت و بژێوی ژیانی خۆت هەبێ بە پێی توانا هەوڵدە، چونکە هەژاری خەم هێنەرو ڕوخێنەرە.

٧٧. ئەگەر موبتەلا بوی بە نەخۆشی و ناخۆشی خۆڕاگربەو فەزەع و هاوار مەکە.

ئەوانەی کە باسمان کرد هەموو شتەکان نەبون بەڵکو هەندێک ڕێنمایی بون بە هیوای نزای بە خێرو سودوەرگرتن.

## کۆتا قسەم لە سەر بابەتی جنۆکە و چونە ناو لاشەی مرۆڤ

من دەمەوێ قسەکانم و تێبینیەکانم لە چەند خاڵێکدا پوخت بکەمەوە دەربارەی ئەم بابەتە:

١. ئەم بابەتە ڕاجیایی لە سەرە لە نێوان زانایانی ئیسلامی، وە دەبێ ئەم ڕاجیاییەش قەبوڵ بکەین و نابێ کەسی لەسەر بە گومرا بزانین ئەگەر لەگەڵماندا بۆچونی پێچەوانەوە بوو، وە هەتا قیامەتیش ئەو ڕاجیاییە هەردەبێ، بۆیە کەسێک پێی وابێ دەتوانێ کۆتایی بەو بابەتە بێنێ و یەکلای بکاتەوە هەڵەیە

٢. هەرشتێک سەر هەڵدەدا پێنج بۆچون لە سەری پەیدا دەبێ:

- هەیە ڕەفزی دەکا یان بە حەرامی دەزانێ.
- هەیە تەواو قەبوڵی دەکا بە ڕەهایی و بەپێویستی دەزانێ.
- هەیە وردەکاری تێدادەکا.
- هەیە لێی بێدەنگ دەبێ.
- وە هەشە بۆی یەکلا نەبۆتەوەو لە لێکۆڵینەوەی بەردەوامدایە.

من پێم وایە مادام شتەکە یەقینی نەبێ بەردەوام یان بە زۆری بۆچونی ئەوانە ڕاستە کە وردەکاری تێدادەکەن و حاڵەتەکان لێک جیادەکەنەوە.

٣. هیچ گومان لە وەدا نیە کە شەیتان و جنۆکە هەن و دروستکراوی خوان و موکەلەفن.

٤. گومانی لەوەدا نییە کە کاریگەریان هەیە بەسەر مرۆڤەوە.

٥. هەموو دینە ئاسمانیەکان لەسەری کۆکن و دان دەنێن بە هێزو دەسەڵاتی شەیتان و جنۆکە .

٦. یەکێک لە پێغەمبەران دەسەلاتی تەواوی بەسەر جنۆکەدا بوە بە پێی دەقەکانی قورئان ئەویش سولەیمانە.

٧. شەیتان ئادەم و حەوای فریوداو ئەوانی لە بەهەشت وەدەرنا.

٨. قورئان و سونەت ڕێنماییمان دەکاو بۆ ڕێگاکانی گومڕاکردنی مرۆڤ لە لایەن شەیتانەوە، وە ڕێگای خۆپاراستنیشمان نیشان دەدا.

٩. شەیتان دەتوانێ زۆربەی مرۆڤایەتی گومرا بکا لە ڕێی سەربازە جنۆکەو ئادەمیەکانی.

١٠. جنۆکەو مرۆڤە خراپەکان پەیوەندییان بە یەکەوە هەیەو کاریگەری و لەزەت وەرگرتنیان لە یەکتر هەیە.

١١. زۆربەی هەرە زۆری زانایان بڕوایان بەوە بوە کە جنۆکە دەچێتە لاشەی مرۆڤەوەو تەلەبوسی پێدەکا.

١٢. بەڵگەکان جۆراو جۆرن لەسەر ئەم بابەتە من پێموایە بەشێکی ڕاستەو خۆ باسی دەکا ئەم بەڵگانە زۆر نین، وە بەڵگەکانی تریش پشتیوانی لەو بابەتە دەکەن بە ناڕاستەو خۆ.

١٣. بەڵگەی واقعی یەکێکە لە بەهێزترین بەڵگەکان کە ناتوانین ڕەتی کەینەوە.

١٤. ئەگەر ئەمە بەشێکی کێشەی دەرونی بێ ڕاستە، بەڵام هەمووی بەوە تەفسیر ناکرێ.

١٥. من حەماسەت و دەمارگیریم نیە هەر کەس ڕوونکردنەوەم بداتێ و قەناعەتم پێ بێنێ کە جنۆکە ناچێتە لاشەی مرۆڤەوە من بە سینگێکی فراوان لێی وەردەگرم.

١٦. پێوەر بۆ ڕاستی و ناڕاستی و بەڵگەو دەلیلە نەوەک زۆرینە، بەڵام ئەگەر زۆرینەی زانایان لەگەڵ بابەتێکدابون وێڕای ڕاستی بوونی شتەکە ئەوە گومان لە وەدا نییە کە بابەتەکە بە هێزتر دەبێ.

١٧. من کە خوێندنەوەم بۆ بەڵگەی هەردوولا کردوە لە هەردولا کەمتەرخەمیم بینیوە، ئەوانەی بڕوایان پێ ییە جاری وایە زیادە ڕەوی تێدا دەکەن، هەموو ڕوداوێک و ناتەندروستییەک دەدەنە پاڵ جنۆکەو چونە ناو لاشەی مرۆڤەوە.

١٨. وە ئەوانەش کە ڕەتی دەکەنەوە دەڵێن توانای شەیتان و جنۆکە تەنیا وەسوەسەیەو هیچی تر، بەڵام ئەوە بەرهەمی دیراسە نەکردنی قورئانە بە وردی.

١٩. کۆمەڵێک فەرموده هاتون زۆر بە ڕوونی باسی بابەتی تەلەبوس دەکەن بەڵام لە سەنەدیان کێشە هەیە، بەشێک لە زانایان بە لاوازیان داناون و بەشێک لە بەر زۆری ڕێگاکانی گەیاندویانەتە پلەی (حەسەن) مادام ئەو بەڵگانە ڕاستەو و خۆن و پاڵپشتیان لە واقع و دینەکان و بەڵگەکانی تر هەیە دەکرێ کاریان پێبکەین.

٢٠. ئەم بابەتە لە بابەتە گرنگیەکانی ئیمان نییە تا ئەگەر کەسێک بڕوای پێنەبوو بە گومڕای بزانین، یان بە پێچەوانەوە.

**تێبینیەکان:**

-مرۆڤ دروستکراوێکی بەڕێزەو بە توانایە لە جنۆکە بە هێزترەو بە تواناترەو زاناترە ئەگەر لە ڕێگای ڕاست لانەدا.

-زیادەڕەوی زۆر هەیە لە بابەتی جنۆکە وایان کردوە خەڵک لاوازبێ و بڕوای بە خۆی نەمێنێ.

-هەرچی بەڵایەک بەسەر مرۆڤدێ بەرهەمی دەستی خۆیەتی، بۆیە دەبێ بگەڕێنەوە بۆخۆمان بزانین چی هەڵەمان ئەنجامداوە چونکە ئەوەفەرمانی خوایە، نەوەک هەموو شتێک بگێڕینەوە بۆ جنۆکە.

-ئەگەر توشی حاڵەتێکی شلەژان و تێکچون بوین دەبێ پەنا بۆ دکتۆر بەرین نەوەک بۆ معالج، ئەگەر لای دکتۆر چارەسەر نەبوو زەرەدی نییە کەسەردانی کەسی چارەسەرکار بکەین.

-دەبێ بزانین کێ باشەو چارەسەر دەکا، کێ ساختەکارو فریودەرو جادوکارە.

-ئێمە لە ٧٥ خاڵدا باسی خۆ پارێزیمان کردوە، با هەوڵدەین خۆمان چارەسەری خۆمان بکەین.

-ئەم بابەتانە بە هیچ شێوەیەک لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان باس نەکرێ و بڵاو نەکرێتەوە مەگەر بەڕێنمایی تەواوەوە نەبێ و بە بەراوردکردن نەبێ لە نێوان زیان قازانجدا.

-ئێمە داوامان لێکراوەو تەکلیف کراوین لە گەڵ مرۆڤ هەڵس و کەوت بکەین نەوەک لە گەڵ جنۆکە بۆیە با ڕووی ژیان و مامەڵەمان لە مرۆڤ بێ نەوەک جنۆکە.

-پێویستە لە پەروەردەی ئیمانی و دەرونیدا ئەم بابەتانە بە هاوسەنگی باسبکرێ و خەڵکی لێ ئاگادارو وریا بکرێتەوە.

ئەوەی کە من لەو ماوەیەدا خەریکی بوم و لە تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان بڵاوم کردەوە بە ئەرکی خۆمم زانی و بە پێویستم زانی، ئەگەر پێکابم ئەوە فەزڵی خوایە

بەتەنیا، ئەگەر هەڵەم کردبێ تەنیا خۆم لێی بەرپرسم داوای لێبوردن لە خوای گەورە دەکەم و مەمنونی هەرکەسێکم هەڵەکانم بۆ ڕاستکاتەوە.

**وصلى الله وسلم على سيدنا محمد وآله**

## سەرچاوەکان لەدوای قورئانی پیرۆز

- ✓ صحيح البخارى
- ✓ صحيح مسلم
- ✓ سنن النسائى
- ✓ سنن ابى داود
- ✓ سنن الترمذى
- ✓ سنن ابن ماجه
- ✓ موطأ امام مالک
- ✓ مسند احمد
- ✓ سنن الدارمى
- ✓ معجم مقاييس /لإبن فارس
- ✓ لسان العرب لإبن منظور
- ✓ القاموس المحيط/ لفيروز آبادي
- ✓ تفسير القرآن العظيم/ لإبن كثير
- ✓ مفاتيح الغيب/ للإمام الرازي
- ✓ جامع البيان/ للإمام الطبري
- ✓ التعريفات للإمام الجرجاني
- ✓ التوقيف على مهمات التعريف/للمناوي
- ✓ الكتاب المقدس

- ✓ التورات السامرية / الدكتور منذر الحايك
- ✓ الموسوعة المفصلة/إعداد مكتبة التبيان /إشراف حسن عبد الحفيظ
- ✓ إبليس/ عباس محمود العقاد
- ✓ ئینجیلی پیرۆز
- ✓ كورد و زەردەشتیەت/ چەند لێكۆڵینەوەیەكی زانستی/ كۆمەڵێك نوسەر
- ✓ إرواء الظمآن بأخبار الشيطان/ حلمي بن محمد بن إسماعيل الرشيدي
- ✓ إبليس وصراعه مع الانسان/منصور عبد الحكيم
- ✓ صراع الانسان والشيطان/ محمد صالح عطية الحمداني
- ✓ الموسوعة الفقهية الكويتية / باب السحر
- ✓ عالم الجن والشياطين/عمر سليمان الاشقر
- ✓ إبليس/عباس محمود العقاد
- ✓ البيان لما ورد في الشيطان/إسلام محمد الغرباوي

# پێرست

